


# پرشنگی رۆژی کوردەواری
# لە
# شەرحی بوخاری

دانەر
مەلا حسین شێخ سعدی

نووسینەوەو ئامادە کردنی بۆ چاپ
بشیر حسین سعدی

بەرگی پێنجەم
لە ساڵی ١٩٥٢ دانراوە

# پرشنگی رۆژی کوردەواری
# لە
# شەرحی بوخاری

دانەر
مەلا حسین شێخ سعدی

نووسینەوەو ئامادە کردنی بۆ چاپ
بشیر حسین سعدی

بەرگی پێنجەم
لەساڵی ۱۹۵۲ دانراوە.



وێنەی دانەر
مەلا حسێن شێخ سەعدی
١٨٨٣ - ١٩٨٣

٦٠٥- العَن المِسْوِر إبن مَخْرَمَةَ أحَبُّ الحَديثِ إليّ أصْدَقُهُ. فاختاروا إحْدى الطائفتَين إما السَبْيُ وإما المال. وَقَدْ كُنْتُ استأنَيْتُ بِكم. قالوا فانَا نَخْتارُ سَبْيَنا. فقامَ رسول الله صلى الله تعالىعليه وسلم في المسلمين فأثنى على الله بما هو أهلُهُ. ثُمَّ قال أمّا بَعْدُ فان إخوانَكم هؤلاء جاؤنا تائبين وإني قد رأيتُ ان أرُدَّ سَبْيَهم فَمَنْ أحبَّ مِنْكُمْ أنْ يُطَيِّبَ بِذلكَ فليفعَل فمَنْ أحَبَّ منكم أنْ يكونَ على حَظِّهِ حتى نُعْطيه إياه من أول ما يَفئُ اللهُ علَيْنا فَلْيَفعَل فقالَ النَاسُ قَد طَيَّبْنا ذلك لِرسولِ اللهِ صلى الله تعالى عليه وسلم لَهُمْ فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم وإنّا لاندْري مَنْ أذِنَ منكم في ذلكَ ممّنْ لم يَأْذَنَ. فارجِعوا حتى يرْافع الينا عُرَفاءكم أمرَكم فَرَجَعَ الناسُ فَكَلَّمَهُم عُرفائهم. ثم رجعوا الى رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم فأخبروه انهم قَدْ طَيَّبوا وأذنوا)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە میسوەری کوڕی مەخرەمەی کوڕی نەوفەلی زهری لە پاش هیجرەت بەدوو ساڵ لە دایك بوو. لە تەمەنی شەش ساڵی لە ساڵی هەشتەمی هیجری. لەمانگی ذي الحجة. هاتە مەدینە ﷺ گوتی پێغەمبەرﷺ هەستا وەکوو ئەشرافی قەبیلەی هەوازنی هاتنە لای. نۆ کەس بوون. داوایان لێ کرد. ماڵو منداڵو خێزانیان کە ئەسیر کرابوون بیاندەنەوە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی خۆشەویست ترینی قسە لای من. ڕاست ترینی قسانە خۆتان هەڵبژێرن. یا ماڵتان بۆ دەگێڕینەوە یاخو منداڵتانو عائلەتان. بەڕاستی من چاوەڕوانی ئێوەم دەکرد. بەڕاستی پێغەمبەرﷺ دە(١٠) و ئەمەندە شەوە چاوەڕێی کردن. وەکوو گەڕاوە لە طائف. پاشان وەکوو یەقینیان کرد پێغەمبەرﷺ لە ئەسیرو لەماڵ هەریەکێکییان بۆ دەگێڕێتەوە. گوتیان خێزانو منداڵەکانی ئەسیر(دیل) هەڵدەبژێرین. ئنجا پێغەمبەرﷺ هەستا لەناو ئەصحابی کیرام

ئەپاش سوپاس و ستایشێکی لایق بەگەورەیی خودا. فەرمووی بەڕاستی ئەم برایانەی ئێوە ئەمانە هاتوونەتە لای ئێمە بە موسوڵمانی و بەگەڕایەوە لە کفری پێشوویان. من خۆم وا بەچاکی دەزانم، منداڵ و عائلەیان پێ بدەینەوە ئنجا هەر کەسێك ڕای پێی پەسەند دەکا با وابکا وەهەر کەسێکیش حەز دەکا لەسەر نەصیبی خۆی بێ هەتا ئێمە لەو ماڵی کە بەبێ شەر کردن لەگەڵ کافران بە دەستمان کەوتووە. کە خودا بۆ پێغەمبەری گێڕابێتەوە پێی بدەوێن. ئەصحابی کیرام گوتیان لەبەر خاتری پێغەمبەرﷺ پەسەندی دەکەین ئەسیرەکانیان پێ بدەینەوە. پاشێلن پێغەمبەرﷺ فەرمووی ئێمە نازانین لە ناو هەمووتان کێ ئیزنی پێ نییە. ئەم ڕایەی من بۆ چاك کردنەوەی دڵی موسوڵمانان بوو ئەم زۆر باس کردنەی لە ئیزن وەرگرتن. ئنجا فەرمووی بگەڕێنەوە لای زاناو سەرۆکەکانتان پرس و ڕا لەگەڵ ئەوان بکەن. با سەرۆکەکان بێنە لای من بڵێن هەموو ئەصحاب ئیزنیان پێ هەیە. ئنجا چوونە لای زانای سەرۆکان ئیزن و ڕازی بوونی خۆیان بەگەورەکان ڕاگەیاند. گەورەکانیش هاتنە خدمەت پێغەمبەرﷺ پێیان گوت. ئەصحاب هەموو بە دڵێکی خۆش ئیزنیانداو ڕای پێغەمبەریان پێ خۆشبوو.

(ش) ئیمامی شافعی لەم حەدیثە وەری گرتووە ئەوانەی تالانی کافرانیان کردووە بەبەش ئەم تالانە دەبنە خاوەنی ئەوەی تالان کراوە. ابو یوسفیش لەم حەدیثە وەری گرتووە: اقراری وەکیل واتە دان پیانانی جێگر دروستە لە جیاتی ئەوەی ئەوی داناوە بەوەکیل(جێگر). ابو حەنیفەو محمەدیش ئەم ئیقرارەیان بەوە بەستووە کە لای حاکم بێ. ئیمامی شافعیش مەنعی کردووە گوتیتی ئیقراری وەکیل(جێگر) لەجیاتی موەکل بە حەقێك کە لەسەر موەکل هەبێ دروست نییە. چونکە خەبەردان بە حەقە کردنە وەکیل قبوول ناکرێ. چونکی زانای قەوم وەکیل

ـمبوون لەلایەن قەوم بەلکی – سەرۆك بوون– ئنجا قبوولی قسەی زانایان لای پێغەمبەر نەبەر ئەوە مەبوو کە وەکیلی قەوم بوون هەرچەندە قسەشیان لای پێغەمبەر وەرگیرا.

٦٠٦– (عن أبی هریرة ﷺ قال صلی اللە تعالی علیه وسلّم: یا أبا هُرَیرة ما فعلَ أسیرُکَ البارحة قال قلتُ: یا رسولَ اللە شَکا حاجةً شدیدةً وعیالاً فرحمتُه فخَلّیتُ سبیلَهُ. قالَ أما انه قَد کَذَبَکَ وسَیَعود ما فعَلَ أسیرُکَ البارحةَ. قلتُ یا رسول الله زَعم انَهُ یعَلّمنی کلماتٍ ینفعنی اللە بها فخَلّیتُ سَبیلَهُ قالَ ما هی قُلتُ قالَ لی اذا اوَیتَ الی فراشکَ فاقرأ ایةَ الکرسی من اولها اللّهُ لا الهَ الا هوَ الحیُّ القَیُّوم حتی تختِم الایة فانکَ لن یزالَ علَیکَ منَ اللهِ حافظ ولا یَقرَبُکَ شیطان حتی تصبِحَ فخَلّیتُ سَبیلَهُ فقالَ النبی ﷺ أما انهُ قَدْ صدَقَکَ وهوَ کَذوبٌ تَعلَمُ مَن تُخاطِبُ منذ ثلاث لیالٍ یا ابا هریرة قلت لا قال ذلک شیطان)

**( تەرجەمە )**

دەگێڕنەوە لە ابو هریرە ﷺ گوتی پێغەمبەر ﷺ منی کردە وکیل بۆ پاراستنی عەمباری زەکاتی سەرفترە لەرەمەزان. دیتم بەشەو یەکێك لەعەمبار بە چەنگان زەخیرەی دەبا لەعەنبار منیش گرتم و گوتم واللە بۆ مرافعەی شەرعییە بۆ خزمەت پێغەمبەر دەت بەم. هەتا حوکم بەدەست بڕینت بکا چونکە تۆ دزی. ئەویش کەوتە پاڕانەوە گووتی بەڕاستی موحتاجی بردنی ئەختی زخیرە بووم بۆ خێزان و منداڵی خۆم کە نەفەقەیان لەسەرم پێویستە بە پێویستی یەکجار زۆر. منیش وازم لێ هێنا، پاشان وەکو سبەینی هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ (کە جیبرائیلیش حکایەتی بزوکەی بۆ گێڕابووە)؛ فەرمووی ئەی ئەبا هورەیرە ئیمشەو ئەسیرەکەی تۆ چی کرد. گوتم ئەی پێغەمبەری خودا گەلێ پاڕاوە و شکایەتی موحتاجی خۆی کرد بۆ عائیلە و منداڵەکانی منیش دڵم پێ سووتا وازم لێ هێناو ڕۆیی. فەرمووی ئاگادار بە، درۆی لەگەڵ کردی.

وەدەشـــگەڕێتەوە. منیـش لەبـەر ئەمـــەم فـەرموودەی پێغەمبـەرﷺ زانیـــم دەگەڕێتەوە. چاوەڕێم کرد بگەڕێتەوە. دیتم شەوی پاشوو گەڕایـەوە. گرتم گوتم ئەم جارە هەر دەتبەمە لای پێغەمبـەرﷺ دوو بـارە زۆر پاڕایـەوە وازم لێ هێنـا بەمـەرجێک جارێکی تـر نێتـەوە. چوومـە خزمـەت پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی ئـەی ئـەبوو هورەیـرە ئەسیرەکەت ئـەم شـەو چـی کـرد. حیکایەتەکـەم بـۆ گێڕایـەوە. فـەرمووی ئاگـادار بـە دەشگەڕێتەوە. پـێی نـاوێ جـاری سـێیەمیش هاتـەوە. ئەمجارەش گـرتم گـوتم ئەمە جاری سێیەمە بۆ لای پێغەمبەرﷺ هەردەتبەم گوتی وازم لێ بینە. هەندێ قسـە هـەن پێت دەلێم کەڵکی‌یان لێ دەبینـی. گـوتم قسـەکان چـین. گوتـی وەکـو هاتی‌یـە جێگای خۆت بۆ نووستن آیة الكرسي﴿الله لا اله الا هو الحي القيوم﴾ بخوێنە هەتا﴿وهو العلـــي العظيم﴾ لە لایەن خوداوە بۆ تۆ پارێزەرێك دەبێ لـە هـەموو بـەڵاو ناخۆشـی هـەتا لـەو جێگایەی شەیتانیش نزیکت ناکەوێ هەتا سبەینە منیـش وازم لێ هێنـا بسـبەینە هاتمە خزمەت پێغەمبەرﷺ حیکایەتەکەم بۆ گێڕایەوە. گوتم بەقسەی خۆی هەندێ کەلیمـەی پێ گوتیمە. فەرمووی کەلیمەکان چین. گوتم پێی گوتم وەکو بۆ خەوتن چووی بۆ سەر جێگا آية الكرسي بخوێنە. تا سبەینە لە حفظی خودا دەبی شەیتانیش نزیکت ناکـەوێ. پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی قسـەیەکی راسـتی پـێ گوتـی یـەعنی ئـەمجارە درۆی لەگـەڵ نەکردی کە زۆریش درۆزنە. فەرمووی ئەرێ دەزانێ ئەمە سێ شەوە قسەت لەگـەڵ کێ دەکرد ئەی ئەبوو هورەیرە. گوتم نا. فەرمووی ئەمە یەکبوو لەشیتانەکان.

(ش) لەم حەدیثە وەرگیرا ئەگەر پیاوێك بیاوێکی کردە وەکیـل لەسـەر شـتێك پاشان وکیل شتێکی تەرك کرد لەوەی پێی سپاردراوە. لەپاشان موەکیـل روخصـەتی دا جـائزەو دروستە. وازانـدرا لـەم حدیثـة دز لـە حـاڵی برسـیەتی دەسـتی نـابڕێ. دروستیشە عەفوو بکرێ. لە پێش گەیشـتن بـۆ لای ئیمـام. وە شـەیتان شـتی چاکیش دەزانێ ئەگەر راست بڵێ. وە کەسێکیش زۆر درۆزن بێ کەم وا دەبێ قسەی راست بکا.

ـشانەی پێغەمبەرایەتیشی تێدا هەیە چونکە فـەرمووی(ئەسیرەکەت چـی کـرد). لـەم
ـحەدیسەش زاندرا(جن) خواردن دەخۆن لەسەر موافەقەی حەدیثی(سألونی الـزاد) واش
ـتعرا جن لەسەر غەیری هەیئـەتی راسـتی خۆیـان خۆیـان بـەدیار دەخـەن. بـۆ انسـان
ـسەش وەك انسانان دەکەن. عوزری درزیش قبوول دەکرێ. بـەیانی فـەضلو گـەورەیی
یة الکرسیشی کرد. عینی(ج٥/ص٧٠٠)

٦٠٧- ((عن أبي سعيد ﷺ من أيْنَ هذا. قالَ بلال. كانَ عِنْدَنا تَمْرٌ رديٌ فبِعتُ
ـنْهُ صاعَيْنِ بِصاعٍ فقَالَ النبي صلى الله تعالى عليه وسلم. أوَه أوَه عينُ الرِّبا عَيْنُ الرِّبا.
لا تَفْعَل ولكِنْ اذا ارَدْتَ انْ تَشْتَري فَبِعْ التَمْرَ ببيْعٍ آخَر ثُمَّ اشْتَرِ بِهِ)).

## تەرجەمە

دەگێرنەوە لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ گوتی بلال هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ
ـەندێ خورمای بەرنی بـۆی هێنـا. خورمـایێکی باشـە رەنگـی زەردە دانـەی خـڕە. لـە
ـمسنەدی ئیمامی ئەحمەد حەدیسیشی دەرحەق هاتووە کە دەڵێ ((الخیر تمرکم البرني
یذهب بالداء)). واتە چاکترینی خورماتان بەرنیـیە کە نەخۆشـی نـاهێلی پێغەمبـەریش
پێی گوت ئەم جۆرە خورما باشەت لەکوێ بوو. گوتی لای ئێمە خورمـای خـراپ هەیـە
دوو صاعم بەیەك صاع برنیدا. بۆ خواردنی پێغەمبەرﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی. ئـۆە
ـۆە. ئەمە عەینی ریبایە. عەینی ریبایە. ئەمە مەکە. بەڵام ئەگەر ویستت برنـی بکـڕی.
خورمای خۆت بە عەقدێکی جودا بفرۆشە بەقیمەتەکەی بەرنی بکرە کە دەکا دوو عقـد.
ـەم حەدیثـە زانـدرا ئەگـەر وەکیـل شـتێك بفرۆشـی بەفرۆشـتنەکی دروسـت نـەبێ.
فروشتنەکەی دروسـت نیـیە. چونکـە بـلال لەلایـەن پێغەمبـەرﷺ کرابـووە وەکیـل بـۆ
خانەی سەعادەتیان. ئەگەر خورما یاشێکیتری بکڕیبوایە. یا بیفرۆشتبایە.

# باب الحرث
# باسی چاندن مزارعة

٦٠٨- ((عن انس ﷺ مَامِن مسلم يغْرِس غرسا أو يزرعْ زرعا فياكل منه طير او انسان او بهيمةٌ الا كانَ لَهُ بهِ صدَقَة)).

**( تەرجەمە )**

دەگێرنەوە لە ئەنەس كوڕی مالك ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی نی‌یە هیچ موسوڵمانێك كە دارێك دابچێنێ یاخۆ لە دانەوێڵەو كشتوكاڵ شتێك بكات پاشان لەوەی تۆی كردووە و دای چاندووە. تەیر یان انسان یاخۆ گیان لەبەر وحیوانات شتێكی ێ بخوا مەگەر ئەم خواردنە بۆ ئەو صەدەقەیەكەو خێرێكە.

(ش) زاندرا لەم حەدیسە گەورەترینی دەسكەوتی مرۆڤایەتی(انسانیەت كشتوكاڵو زراعەتە پاشان بازرگانی(تجارەت) پاشان كارەكانی تر كە مرۆڤ بەدەستی خۆی بیكا. هەندێ عولەماو زاناش گوتوویانە. باشترین كار بە گوێرەی پێویستی‌یەكانی مرۆڤە لە كاتە جۆر بەجۆرەكانی دونیا.

٦٠٩- ((عن ابی امامة الباهلی ﷺ لايَدْخُلُ هذا بَيْتُ قَومٍ الاّ ادْخَلَهُ اللّهُ الذُلَّ))

**( تەرجەمە )**

دەگێرنەوە لە ئەبو ئیمامەی باهیلی – ناوی صودەی كوڕی عەجلان بوو ئاخری ئەو صحابانە بوو كە لە شام وەفاتی كرد (لە بوخاری بێ لەم حەدیسەو حەدیسی‌تری نی‌یە). چاوی بەگاسنێكو ئالەتێكی جووت كەوت گوتی بیستم لە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی داخیلی هیچ خانووی هیچ قەومیك نابی ئەم ئەسبابو ئالاتی جووت كردنە

مەگەر بەبێ شك خودا زەبوونی دەخاتە ناو ئەو خانووە. لەبەر زوڵمو ستەمو غەدری خاوەن عارد دەر حەق جوتیارەکانیان. کە وەکو عەبدو کوێلە خدمەتی خۆیانو قوناغەکانیان پێ دەکەن لە پاش مردنیشیان خۆم دیومەماڵ و کچەکانیان بە میرات دەگرن. خۆ ئەگەر بەقەدەر سەری دەرزی بەزەعمی خۆیان شتێکی نامەشروعیان لێ ببینن. لەسەر ئەمەندەی استحقاقی خۆیان جەزایان لێ دەسێنن ناشوێرن خەبەری حکومەت بدەن. ئەوەك جوتەکانیان بەربدەن (لا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم).

بەراورد کردن لەبەینی ئەم حەدیسەو حەدیسی پێشوو ئەمەیە. لە دونیا خاوەن کشتوکاڵ لە ناخۆشترین دەسکەوت دایە لەبەر ژێردەستی بۆ دەرەبەگ. وە لە ئاخیرەتیش لە پاش کەسبی عیلم لەپیرۆزترینی دەست کەوتان لەبەر چاکەو خێر. چونکە خەڵکی خێرو چاکە لە کشتوکاڵ دەبینن.

٦١٠- العن ابى هريرة ﷺ مَنْ امْسَكَ كَلْباً فانهُ يَنْقُصُ كل يَوْمٍ مِنْ عَمَلِهِ قيراط الا كلبَ حَرْثٍ او ماشِيَةٍ. وفى رواية عنه الا كَلْبَ غَنَمٍ او حَرْثٍ او صَيْدٍ)).

### تەرجەمە

دەگێرنەوە لە ئەبو هريرە ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی هەر کەسێك سەگێك لای خۆی رابگرێ بێ گومان هەر رۆژێك مقداری یەك قیراط لە کردەوە چاکەکانی کەم دەبێ. الا مەگەر سەگی کشتوکاڵ بێ یاخو بۆ پاسی مەڕومالات رای بگرێ. لە ریوایەتێکی تر لە ئەبوو هورەیرەوە دیسان ئیلا مەگەر سەگی راوبێ.

(ش) لای ئیمامی شافعی ئەگەر چی سەگ بەحەوت ئاو نەبێ جێی دەوی پاك نابێتەوە بەلام را گرتنی بۆ پاسی مەڕومالات دروستە. لە مەزهەبی مالکیش استدلاليان کردووە بەدروست بوونی راگرتنی سەگ لەسەر پاك بوونی سەگ. چونکی دەڵێن مادام دروستە راگرتنی سەگ زەحمەتە خۆ پاراستن لە دەست لێدانی. چونکە ئیزن لەشت

عەینی ئیزنە لە موکمیلاتی مەقصودی ئەو شتیش هەروەکو مەنعی لەوازماتی شت مناسبە بۆ مەنعی شت. ئەم قاپەی یا مەنجەڵەی کە دەمیشی تیّ ناوە بەحەوت شوشتنەوەکەی لەبەر خواپەرستییە(تەعەبوودیە) لەبەر پیسی سەگ نییە. ئەوانەی لەسەر مەزهەبی شافعیین ئەوانیش دەڵێن شوشتن لەبەر پیس بوون نەبێ لەبەر هیچ شتی تر نییە. کەوایە فەرمان کردن بەشوشتنی ئەوشتی سەگ دەمی تیّ نابیّ لە حەدیسی کە هاتووە. دەر حەق دەم تێنانی سەگ دەلالەت دەکا لەسەر پیس بوونی دەمیو سائری لەشی ئەم حەیوانەش کە سەگە. بەطریق الاولی. ئیمامی حەنەفیش گوتویەتی سەگ تەنیا لیکاوی نێو دەمی پیسە ئیسقانوو مووی پاکە پێستەکەشی بەدەباغ پاك دەبێتەوە.

٦١١- العن ابی هریرة ﷺ بَيْنَمَا رَجُلٌ راكِبٌ عَلى بَقَرَةٍ الْتَفَتَتْ اليَه فَقَالَتْ لَم اخْلَقْ لهذا خُلِقْتُ لِلحراثَةِ آمنتُ بِهِ اناوابو بكر وعمر وآخَذَ الذِئْبُ شاةً فَتَبِعَهُ الرامي فقال الذِئْبُ مَن لَهَا يومَ السَّبُعِ يومَ لا راعِيَ لَهَا غَيرى قالَ آمَنْتُ بهِ انا وابو بكر وعمر قال الراوي عن ابي هريرة وما هُما يَوْمَئِذٍ فى القوم).

( تەرجەمە )

دەگێرنەوە لە ئەبوو هورەیرەﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی لە زەمانی بەنی ئیسرائیل پیاوێك سواری مانگایێك ببوو. مانگایەکە ئاوڕێکی لە پیاوەکە داوە گوتی. من دروست نەکراوم بۆ ئەمە سوارم ببن. من دروست کراوم بۆ جووت ئەهلی مجلس بەسەرسورمانەوە گووتیان سبحان الله مانگا قسە دەکا. پێغەمبەرﷺ فەرمووی جیّی سەرسورمان نییە. من باوەڕم هەیە بەوە مانگا قسە بکا ابو بکرو عومەریش باوەڕیان هەیە وەفەرمووشی لەزەمانی پێشوو گورگ مەڕێکی برد شوان کەوتە شوێن مەڕەکە لە گورگی قورتار کرد گورگ لە شوانەکە بەقسە هات گوتی لەڕۆژی سەبوع(کە ڕۆژی

جەژنەیان بوو لە زەمانی جاهلیەت لەبەر گەمەو گالتە شوان ئاگای لەمەڕ نەدەما)کێ هەیە بە ئیمدادی مەڕ بگا کە هیچ شوانی لەبەر نیە لە خۆم نەبێ. ئەصحاب دووبارە گووتیان سبحان الله گورگ قسە دەکا. پێغەمبەر ﷺ بۆ نەهێشتنی سەرسوڕمان فەرمووی من باوەڕ دەکەم گورگ قسە دەکا ئەبو بکرو عومەریش باوەڕ دەکەن. ئنجا ئەبوو هورەیرە گوتی ئەبو بکرو عومەریش ئامادەی مەجلیس نەبوون ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەر ﷺ ئەم حەدیسەی فەرموو. منیش عەرزتان دەکەم ئیمرۆ کە تاریخی ١٩٥٣م ١٣٧٢هجری داین عالەمی اسلامی ئەگەر چی وەکو مەڕ لە یوم السبع دایە بەڵام ئومیدێکی بەهێز هەیە خودای عزوجل خۆی شوانیکمان بۆ بنێری لەگورگی استعمار قورتار ببین.

٦١٢- العن ابي هريرة ﷺ قالَتِ الانصارُ للنبى صلى الله تعالى عليه وسلم اقسِمْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ اخوانِنا النَخيلَ قالَ لا فَقالوا تكفونا المؤُنَةَ وَنُشْرِكْكم فى الثَمَرَةِ قالوا سَمِعْنا واطَعْنا)).

## تەرجەمە

دەگێرنەوە لە ئەبوو هریرە ﷺ پێغەمبەر ﷺ وەکوو هیجرەتی کرد بۆ مدینە ئەنصاری عەرزی پێغەمبەریان کرد ئەی پێغەمبەری خودا ئەم دارخورمایانەی هەیتمان لەبەینی ئێمەو لەبەینی برایانی موهاجر بەشی بکە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی نابێ شتی وا. پاشان ئەنصار واتە خەڵکی مەدینە بەوانەیان گووت کە موهاجر بوون لە مەکە هاتبوون کە وایە ئێوە خزمەتو تەربییەی باخچەکانمان بکەن بەرهەمەکەیان بەشەریکیمان بێ. گووتیان باشە ئەمە قبوول دەکەین.

(ش) رازی نەبوونی پێغەمبەر ﷺ ونەهیشتنی بەدابەش کردنی باخچەکان لەبەر ئەمەبوو. دەیزانی فتوحاتو کردنەوەیان بۆ وولاتان زۆر دەبێ حەزی نەکرد زیان

بەئەنصار بکەوێ لە شتێ کە گوزەرانییان بەئەو بوو. ئەنصار وەکو تێ گەیشتن لەگەڵ مهاجوەکان لەسەر ئەم شرکەتە رێك کەوتن کە بەرژەوەندی(مەصلەحەتی) هەردوولای تیابوو ئەم شرکەتەش عەینی موساقاتە بەشەرع. موساقاتیش شرکەتیکە لە نێوان خاوەن موڵك وکرێکار لەسەر سێ یەکی یانیوەی بەرهەم پاش ایجابی مالكو قبوولی کرێکار کە روکنن لە موساقات. بەم تەرزە خاوەن ملك بلێ سێ یەکی یانیوەی یا چارەکی ئەم باخچەیەم داتو بە پەروەردوکردنی ئەم باخچەیە. کرێکاریش بلێ قبوولم کرد.

٦١٣- ((عن ابن عباس ﷺ ان النبی صلی الله تعالی علیه وسلم لم ینه عن الکراءِ وَلکِنْ قالَ ان یمنَحَ احدکم اخاهُ خَیْرٌ له من ان یاخذ علیه خرجا معلوما)).

( تەرجەمە )

دەگێرنەوە لە عبدالله ی کوری ئیمامی عباس رەزای خودایان لێ بێ گوتی بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ نەهی نەکردووە لە کرێ و ئوجرەی عارد بۆ کشتوکاڵ بەبێ بەدەل عارد بەبرای دینی خۆی بدا باشترە لەمە کە شتێکی مەعلومی لێ وەربگرێ.

(ش) چونکی زۆر مونازەعەو بەربەرەکانی لەبەینی کرێکارو خاوەن ملك لەسەر کرێی روو دەدا هەتا بەدەرەجەیەك دەگەیشتە کوشتن. ئنجا ئەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر وەجهی تەحریم نییە بەڵکی لەبەر ئەوەبوو کە عەداوەتو دەژمنایەتی رووی دەدا لەبەینی خۆیان.

٦١٤- ((عن عبدالله بن عمر رضی الله عنهما ان النبی صلی الله تعالی علیه وسلم عامَلَ خَیبَر بِشَطرِ مایَخرُجُ مِنْها مِنْ تَمر او زرع وکان یعطی ازواجه مائة وسَق، ثمانین وَسقَ تمر وعشرینَ وَسقَ شَعیرا)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی عومەر ڕەزای خودایان لێ بێ گوتی بەڕاستی پێغەمبەرﷺ وەکوو خەیبەری گرتو بووە موڵکی خوداو پێغەمبەرو موسوڵمانان ئیرادەی فەرموو جوو دەر بکا لە خەیبەر جوولەکەکان تکایان کرد لە نیشتمانی خۆمان دەرمان مەکە خزمەتی باغەکانو کشتوکاڵ دەکەین. بەنیوەی سوودەکان(مەنافع) ئنجا پێغەمبەرﷺ موعامەلەی لەگەڵ کردن بە نیوەی سوودو بەرەکانی باغەکانو کشتوکاڵ لەخورماو ترێو دانەوێلە لەو مەنافعە سەد وەسقی درایە ژنەکانی پێغەمبەرﷺ. هەشتا وەسق خورما بیست وەسق جۆ وەسق شەست صاعە هەر یەك صاع هەشت مستە.

لەم حەدیسەدا دەلالەت هەیە لەسەر دروست بوونی موزارەعە کە تۆ لەلایەن خاوەنی عارد بێ هەتا زەمانی پێغەمبەرﷺ و ئەبوبەکر بەم تەقریرە کاریان کردووە هەتا حەزرەتی عومەر دەریکردن لەنیشتمانی خۆیان.

بەم جەوازە حوکمیان کردووە ابن المنذرو ابن خزیمەوخطابی. ابن خزیمە کتێبێکی داناوە کە یەگ بەرگە بەیانی عیللەتی ئەو حەدیسانەی کردووە کە دەر حەق بە نەهی هاتوونە کردیتی. وە لەگەڵ ئەو حەدیسانەی هاتوونە دەرحەق بەجەوازی جەمعی خستونەتە بەین. پاشان لە متابەعەی ابن خزیمە خطابیش گوتیتی ئەحمەد کوڕی حەنبەل ئەم حەدیسانەی بەزەعیف داناوە کەدەرحەق بەنەهی هاتوونە گوتیتی حەدیسی نەهی تەواو نی‌یە(مضطربة) گوتیشیتی مالكو ئەبوو حەنیفەو شافعی بۆیێ ابطاڵیان کردووە چونکی ئاگاداریان نەبووە لەسەر عیللەتی حەدیسی نەهی. موزارەعەش کە کارێکی موسوڵمانانە لە هەموو وولاتان ابطاڵی عەمەلی پێ نەکردووە هیچ یەکێك(واتە کارپێکردنی بەراست زانیوە)تا ئێرە قسەی خطابی بوو. شەرقاویش دەڵێموختار لای زاناکانی باسکراو موزارەعەو موخابەرە هەردوویان دروستن. ئەحادیثی موشعیر بەنەهیش تەئویل کراون. (شەرقاوی) ج٢/لاپەڕە٢١٧.

تێبینی:موزارەعە ئەوەیە کە تۆ(بذر) لە لایەن خاوەن عارد بێ.

موخابەرەش:ئەوەیە تۆ لە لایەن جوتیار بێ.

٦١٥- ((عن عائشة ﷺ مَنْ اعْمَرَ أرْضاً لَيْسَتْ لأَحَدٍ فَهُوَ أَحَقُّ)).

**تەرجەمە**

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) پێغەمبەرﷺ فەرمووی هەرکەسێك عاردێکی بێ خاوەنی دوور لە ئاوەدانی بێ هەموو لایەك ئاوەدان بکاتەوە ئەو کەسە موستەحەق ترە لە خەڵکیتر. حکومەت ئیزنی پێ هەبێیا پێ نەبێ تەنێ خاوەن شەرع ئیزنی پێ هەبێ کە پێغەمبەرە. ئەمەلای ئیمامی شافعی وابوو لای یوسفو محمدیش هەر وایە بەڵام گوتویانە سونەتە ئیزن وەرگرتن. ئەبوو حەنیفەش گوتیتی دروست نییە احیای مەوات یەعنی زیندوو کردنەوەی عاردی بێ خاوەن بەهیچ جۆرێك بە ئیزنی حکومەت نەبێ.

٦١٦- ((عن ظُهير بن رافع ﷺ ما تصنعونَ بمحاقِلِكم قلتُ نؤاجِرُها على الرُّبعِ وعلى الأوْسَقِ من التمر والشعير قال لاتَفْعَلوا إزرعوا او أزرِعوهاوأمْسِكوها)).

**تەرجەمە**

دەگێڕنەوە لە ظوهەیری کوڕی رافعی ئەنصاری ﷺ گوتی پێغەمبەرﷺ بەخصوصی بانگی کردم فەرمووی ئێوە چی لە کشتوکاڵی خۆتان دەکەن ووتم بە کرێیان دەدەین. بەچارەکێکی بەرهەم. وەچەندوەسقێکی موعەیەن لەخورماو جۆ. لە لایەن خاوەن عارد بۆ کرێکار(عامل) فەرمووی وا مەکەن خوتان عاردەکان دابچێنن یاخو بەبێ کرێ بیدەن بەیەکێکی تر دای بچێنێ. یاخو واز لە داچاندنی عاردەکان بینن

هەروا بمینینەوە منیش پێم گوت ئەمری تۆو مەسموعەو موطاعە واتە قسەت لەسەر چاو بە گوێت دەکەین.

(ش) ئەم حەدیثە وا دەگەیێنێ کە دروست نیە موزارەعە. ئەگەر چی راستیشە بەڵام دروست نەبوونی لەبەر شەرتێکی فاسدبووە. یا خۆ لە موقابەلەی کرێیەکی دیاری نەکراو بووە. ئەگەر نا موزارەعە بەنیوەیی یابەسێ یەك یابەچارەك دروستە بەدەلیلی حەدیسی عبداللەی کوڕی عمر لەباسی ئەهلی خەیبەر لە لاپەڕەی رابردووکە چەند لە ئەصحابەی گەورەش وەکو حەزرەتی عەلیو ابن مەسعود و سەعدو زوبەیرو ئوسامەو عبداللەی کوڕی عومەرو مەعاذو خەباب. لە گەڵ چەند زانای گەورەش وەکوو ابنی موسەیەبو طاووسو ابن ابی لیلیو ئەوزاعیو ثەوریو ئەبو یوسفو محمدو امام ئەحمەد حوکمیان کردووە بە جەوازی موزارەعەو موساقات وەبەشێکی تریش لە ئەصحابە گەورەکان. وەکو ابن عباسو ابن عومەرو عەکرەمە. لەبەر حەدیثی زوهەیری کوڕی رافع یەعنی ئەم حدیثە. کەوتوونەتە تەرەدوو دوو دڵی کەرهاندوویانە(واتە پەسەندیان نەکردووە) لەبەر تەقوی عارد بە موزارەعە بدەن. امامی مالكو ئەبو حەنیفەو ئیمامی شافعیو لەیثو ئەبو ثەور. لەسەر پەسندنەکردنی ئەوان حوکمیان بەدروست نەبوونی موزارەعەو موساقات کردووە. نەك لەبەر تەحریمیان. چونکە هەموو خەڵکی مەدینە لەزەمانی سەعادەتی نەبەویە(واتا لەزەمانی پێغەمبەرﷺ) موزارەعەو موساقاتیان دەکرد.

٦١٧- (العن ابی هریرة ﷺ انَّ رَجُلا مِنْ اهلِ الجنَّةِ استَأْذَنَ ربَّهُ فی الزَّرعِ فقالَ لَهُ اَلسْتَ فیما شِئْتَ قالَ بَلیَ ولکنی احِبُ انْ ازْرَعَ قالَ فَبَذَرَ فَبادرَ الطَّرْفَ نَباتُه واستِواءُهُ واستحصادُهُ فکانَ امثالَ الجبالِ فَیَقولُ اللّهُ تعالی دونَکَ یا ابنَ آدم. فانَّهُ لا یُشْبِعُکَ شَيء. فقالَ الاعرابيُّ واللّهِ لا نَجِدُهُ الا قُرَشیا او انصاریا فانهم اصحابُ زَرْعْ وامَّا نَحْنُ فلَسْنا باصحابِ زَرْع فَضَحِکَ النبی صلی اللّه تعالی علیه وسلم).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە ﷺ. گوتی رۆژێك پێغەمبەر ﷺ قسەی دەکرد لەگەڵ یارانی خۆی. پیاوێکی بادیەش لەو مەجلیسە بوو. فەرمووی رۆژی قیامەت پیاوێك لە ئەهلی بەهەشت ئیزن لە خودا دەخوازێ فەلاحەت کشتوکاڵ بکا خودا دەفەرمووی ئەدی تۆ هەموو ئارەزۆییێکت جێبەجێ نەبووە دەڵێ بەڵێ هەموو ئارەزوویێکم بەجێ گەیشتووە بەڵام حەزم لە کشتوکاڵە خودای گەورە ئیزن دەدا. تۆ دەخاتە عاردی بەهەشت بەقودرەتی خودا وەکوو تۆ دەکا دەبینی هەر لەو ساعاتە شینیش بووەو زەمانی درەویش هات بەچاو کوتانێك هەر دانەیەکیش بەقەدەر کێوێك بوو بەبێ ماندوو بوون و ئیش تێکردن(ئەمە ئیشارەیە وەبال بێ نیازکردنی خودا بۆ ئەوانەی لەبەهەشتن لە ئەزیەت و ماندوویەتی مەحصولاتی خۆیان ﴿لايمسهم نصب ولا لغوب﴾. ئنجا خودای گەورە دەفەرمووی ها بگرە مەحصولاتی فەلاحەتی خۆت ئەی کوڕی ئادەم هیچ شتێك تێرت ناکا پیاوەکەی خەڵکی بادیەکە لەمەجلیس بوو گوتی والله نابینین ئەم کەسەی لەبەهەشت کشتوکاڵ دەکا ئیلا مەگەر یاخۆ یەکێکە لە قورەیشییەکانی مەکە. یان کەسێکە لە ئەنصارییەکانی مەدینە چونکی ئێمەی بادیە نشین کشتوکاڵ ناکەین پێغەمبەر ﷺ پێکەنی.

ئەم حەدیثە دەلیلە لەسەر ئەم حەدیثانەی کە ئەوە دەگەیەنن نابێ عارد بە کرێ بدرێ. بەم جهەتی نەدبە. بەجهەتی ایجاب نییە. چونکی عادەت لەو شتی کە بەشەر زۆر لەسەری حەریص بێ. ئەمەیە مەنع نەکری لە استمتاع بەو شت. وە دەلیلیشە لەسەر هێشتنەوەی رەوشتێکی کە رشتیو(حیرصە). لە پیاوی حەریص لەناو بەهەشتیش چونکی لەسەر خۆشەویستی کشتوکاڵ مردووە. هەر وەکو گوتراوە بە عەرەبی (المرء يموت على ما عاش عليه، ويبعث على ما مات عليه). وە دەلیلیشە لەسەر وجودی هەموو شتێکی نەفس ئارەزووی بکا لە ئیش و کاری دونیا لە نێو بەهەشت ﴿وفيها ما تشتهيه الانفس وتلذ الاعين﴾

# كتاب المساقات والشرب

# ((باسى ئاودان و خواردنەوە))

٦١٨- ((عَنْ سَهل ابن سَعْد ﷺ ياغلامُ أتَأْذَنُ لى انْ اُعْطِيَهُ الاشْياخَ. قالَ ما كُنتُ لأوثِرَ بِفَضْلي مِنْكَ أحداً يا رسولَ الله فأعْطاهُ اياه)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لەسەهلی کوڕی سەعدی ساعدی ﷺ. گوتی بادەیەك لە مەشروبات بۆ پێغەمبەریان هێنا. ئنجا یا شیری تەواو بوو یاخۆ شیرو ئاو بوو. پێغەمبەرﷺ نەختێکی لیْ خواردەوە. لەلای راستی عبداللەی کوڕی عەباس دانشتبوو بچووکترین قەوم بوو پێغەمبەرﷺ فەرمووی ئەی کوڕە ئیزن دەدەی پاش ماوەی مەشروبەکە بدەمە اختیارەکان لە مەجلس کە حەزرەتی خالدی کوڕی وەلیدیش یەکێك بوو لە اختیاران کە لە لای چەپی پێغەمبەر دانشتبوون. عبدالله گوتی بۆ پاش ماوەی تۆ هیچ کەسێ پێش خۆم ناخەم ئنجا پێغەمبەرﷺ پاش ماوەکەی دا عبدالله.

(ش) ئەم حەدیثە دەلیلە لەسەر دروست بوونی بەش کردنی ئاو. وەدەیشبیتە موڵك چونکی ئەگەر نەبێتە موڵك بەش کردن لە ئاو دروست نی‌یە.

٦١٩- ((عن أنسٍ الايْمَنَ فَالأيْمَن فاعطاهُ النبىُ الاعرابيَّ الذى عَنْ يَمينِهِ)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەنەسی کوڕی مالكﷺ گوتی مەڕێکی دابەستومان هەبوو شیری هەبوو. مەڕەکەمان دۆشی لەبیری خانووی خۆمان نەختێ ئاومان تێ کەڵ کرد پێشکەش پێغەمبەرمان کرد. پێغەمبەریش لەلای حەزرەتی ئەبوو بەکر دانشتبوو لە

لای راستیش عەرەبێکی خەڵکی بادیە دانشتبوو پێغەمبەرﷺ خواردیەوە. وەکوو لە لێوی پیرۆزی جیا کردەوە. حەزرەتی عومەر ترسا بەرماوەکەی بداتە عەرەبەکە. گوتی بیدە بە ئەبو بەکر ئەی پێغەمبەری خودا لەتۆ نزیکە. پێغەمبەرﷺ دایە عەرەبەکەی لای راستی ئەگەر چی لێشی دوور بوو بەزمانیش فەرموویتی پێشکەش لای راست بکەن.

(ش) بە اتفاق پێشکەش کردنی لە لای راستەوە سونەتە. با پیاوەکانی لای چەپیش بەپایەو گەورەیی بەشەرەفتربن. بەبێ جیاوازی لەسەر ئەم رایە. لای ابن حزم نەبی گوتیتی واجبە پێشکەش کردن لە لای راست ئەگەر بەبێ ئیزنی پیاوی لای راست بە پیاوی لای چەپ بدرێ دروست نی‌یە بە حەدیثی ٦١٨ وە حە دیثی ٦١٩.

٦٢٠- ((عن ابی هریرة ﷺ لا یمُنَع فَضْلُ الماءِ لِیُمْنَعَ بِهِ الکَلأ)).

**تەرجەمە**

دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرەﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی قەدەغە ناکرێ ئاوی زیاد لەخاوەنی خۆی بۆ خاتری پارێزگاری لەوەڕی حەیواناتو گیاو پووشی دەورووپشتی ئاوەکە.

((واتەی حەدیث))

یەکێك ئاوێکی بۆ خۆی دەرهێنا. لە دەشتێکی چۆل. لەدەورەی ئاوەکەش لەوەروو پووش و گیا هەبوو. هیچ ئاوی تریش نەبوو بێ لەو ئاوە. حەیواناتیش ئەگەر نەهاتبایە سەر ئاوەکە نەدەگەیشتە لەوەڕەکە. بۆ خاوەن ئاو نی‌یە قەدەغەی ئاوی زیاد لە خۆی بکا چونکی ئەگەر ئاو قەدەغە بکا. دەبێ مەنعی لەوەڕیش بکا. مەنعی لەوەریش قابل نی‌یە. چونکی زەرەر گەیاندنە بەخەڵکی. وە بەحەیواناتیش ئەگەر موحتاجی ئاو بن چونکی ئەگەر تێنوو بنو مەنعیش بکرێن لە ئاو. امتناع دەکەن

ەخواردنی گیاو پوشی دەرەوەی ئاوەکەش. گیاو پووشیش کەلـە عـاردی مـەوات بـێ.
یەعنی عاردی مەملوکە نەبێ هەموو خەڵك تیایدا هاوبەشن. نافرۆشـرێ هەرکەسـێك بـێ
حصەی خۆی تیا هەیە. ئاوی بێ خاوەن‌و ئاگری بـێ خـاوەن وەکـو گیـاو پووشـی بـێ
خاوەن لامی لیمنع(واته پیتی لام لە ووشەی لیمنع) بۆ عاقیبەتـە. وەکـو لامـی کـەلامی
مەجید(فالتقطه آل فرعون لیکون لهم عـدوا وحزنـا) یـەعنی هـەتا لـە عاقبـەت‌و آخـر
لامر سەربکێشی بۆ مەنعی پووش و گیای بێ خاوەن.

٦٢١- (العن عبدالله ﷺ عن النبى صلى الله تعالى عليه وسلم مَنْ حَلَفَ على يَمين يَقْتَطِعَ بها مالَ امرئٍ مُسْلِمٍ. هوَ عَلَيْها فاجِرٌ لَقِيَ اللهَ. وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبان. فـانْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلْ ﴿انَّ الذينَ يَشْتَــرونَ بِعَهْدِ الله وايمانهم ثَمَنـــاً قَليـــلاً ... الآيـــة﴾ فجاءَ الاشْعَثُ فَقَالَ ما يُحَدِثُكم ابـو عبـد الرحمن فِيَّ أنزلَت هـذة الاية كـانَتْ لى بِئْرٌ فـى ارض ابنِ عَمٍ لى فَقَالَ لى شُهُودَكَ. قُلْتُ مالى شُهُود قَالَ فَيَمِيُنه قُلْتُ يا رسولَ اللهِ اذاً يَحْلِف. فَذَكَرَ النبىُّ هذا الحديثَ فانْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَل تَصْديقا لَهُ).

## تەرجەمە

دەگێرنـەوە لـە عبـدالله ی کـوڕی مەسـعود ﷺ کـە ئـەویش لـە پێغەمبـەرﷺ
دەگێڕیتەوە فەرمووی هەر کەسێك بە درۆ سوێندێك بخوا کە ماڵی پیاوێکی موسـوڵمانی
پێ بخوا بە ناحەق. دەگاتە خزمەت خودا لە ڕۆژی قیامەت. کە خوداش لە رق دایـە لـە
ئەو. ئنجا خودا بۆ راستی فەرموودەی پێغەمبەری خۆی ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارێ.
﴿ان الذين يشترون بعهد الله وايمانهم ثمنا قليلا... الخ﴾ یەعنی ئەوان کەسانێ دەکرن بە
عەهدی خودا کە باوەڕ بەخوداو پێغەمبەرە کفرە. وەدەیشکرن بەسوێندی بەدرۆ مـاڵی
دونیا کە نەفعێکی زۆر کەمە. ﴿اولئك لا خلاق لهم في الاخرة ولا يكلمهم الله ولا ينظـر
اليهم ولهم عذاب اليم﴾ ئەوان نەصیبیان لە بەهەشت نی‌یە خودا نایان دوێنـی‌و ئـاورێ

یان لیّ ناداتەوە. بۆ ئەوانیش هەیە عەزابێکی بە ئازار. لەو دەمەیش ئەشعەث ی کوڕی کندی لە مەجلسی خۆی هاتە مەجلسی عبداللەی کوڕی مەسعود. گوتی ئەو حەدیثی بۆ ئیوە دەخوێنێتەوە. دەرحەق بەمن ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە. سەبەبیش ئەمە بوو. من بیرێکم هەبوو لە عاردی ئامۆزاییێکی خۆم کە ناوی معدان کوڕی ئەسوەدی کوڕی مەعدی کندی بوو. لەقەبی جەشیشە بوو. بیرەکەی لیّ زەوت کردم موحاکەمەمان کەوتە خزمەت پێغەمبەرﷺ پێغەمبەر ئەمری بەمن فەرموو شاهێدان بینە. گوتم هیچ شاهیدم نییە. فەرمووی سوێندی بدە. گوتم یارسول الله کەوایە سوێند دەخوا. ئنجا پێغەمبەرﷺ ئەم حەدیسەی فەرموو. خودای گەورەش بۆ تصدیقی پێغەمبەری خۆی ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ

## موتەرجم ئەڵیّ:

## سوێند لەسەر سێ بەشانە :

((یەکەم)): سوێندی غەمووس کەلەسەر شتی رابردوو سوێند بخورێ بەدرۆ. مەثە لەن مالێکی لەسەر هەبێ بلێ لەسەرم نییە. یا شتێکی زەوت کردبێ بلێ ئەم کردووە سوێندی ئەم حەدیثەش سوێندی غەمووسە. بۆیێ غەمووسی پێ دەڵێن. دەگێڕنەوە دەڵێن چونکی غەمسی دەکا لەبەحری گوناە: واتە نقومی دەکا، لە حەدیث هاتووە لە غەیری بوخاری (الیمین الغموس تدع الدیار بلاقع) یەعنی سوێندی غەمووس چەند ماڵ دەکاتە چولگە. ئەمی لای حەنەفی کەفارەی نییە. چونکی بەموجەیەدی کەفارە خودا لیّی خۆش نابی. بەڵکی دەیەوێ تۆبە بکا و لە خودا بپارێتەوە. ئەوەی زەوتی کردووە بگێڕێتەوە. گەردەنی خۆشی بە خاوەن حەق ئازاد بکا.

((دووەم)): سوێندی مونعەقیدە واتە سوێند لەسەر شتی پاشەڕۆژ. مەثە لەن بلێ واللە فلان شت ناکەم یاخۆ فلان شت دەکەم. ئەگەر ئەم سوێندەی بەجێ

نەگەیاند. دەبێ کەفارە بدا. کەفارەش دەبێ یاخود عەبدێك ئازاد بکا. یاخو نانی دە فەقیر بدا. یا جلێکیان بۆ بکا یا خۆ سێ ڕۆژ بەڕۆژو ببێ. ئەم بەشە سوێندەشی ئەگەر لەسەر شتی بێ شەرعی بێ وەکوو سوێند بخوا بلێ نوێژ ناکەم یاخو لەگەڵ فلان قسەناکەم دەبێ لەگەڵ نەقضی سوێندەکەشی کەفارەش بدا.

((سێیەم)): سوێندی لەغو: سوێندی لەغو لای حەنەفی ئەو سوێندەیە بەدرۆ لەسەر یەقینی خۆی سوێند بخوا. لای شافعیش ئەو سوێندە یە لەکاتی قسەکردن بێتە سەر زمان واللە وا بوو. واللە وا چوو. واللە واو واللە وا ئەمە نە کەفارەی لەسەرە نە گوناهیشە. بەڵام لەم تەرزە سوێندەش هەتا پێت دەکرێ خۆت بپارێزی باشترە.

٦٢٢- ((عن ابي هريرة ﷺ ثَلاثَةٌ لايَنْظُرُ اللهُ اِلَيْهِم يَوْمَ القِيامَـةِ وَلا يُزَكّيهِم. وَلَهُمْ عَذابٌ أليمٌ رَجُلٌ كانَ لَهُ فَضْلُ ماءٍ بالطَّريقِ فَمَنَعَهُ مِنْ ابْنِ السَبيلِ. ورَجُلٌ بَايَعَ اِمامَهُ. لا يُبايِعهُ الا لِدُنْيافانْ اعْطاه مِنْها رَضيَ وانْ لمْ يُعْطِه مِنْها سَخِطَ وَرَجُلٌ أقامَ سِلْعَتَهُ بَعْدَ العَصْرِ فَقَالَ واللهِ الذي لا الهَ غَيْرُه. لقَدْ اعْطَيْتُ بها كَذا وكَذا فَصَدَّقَهُ رَجُلٌ ثُمَّ قَرأ ان الذينَ يَشْتَرونَ بِعَهْدِ اللهِ وايمانهم ثَمَناً قَليلا)).

تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبوو هوریرە‌ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی سێ کۆمەڵ هەن لە خەڵکی خودای گەورە ڕۆژی قیامەت ئاوڕیان لێ ناداتەوە کە بە لطف تەماشایان بکا وە پەسەندیشیان ناکا لە گوناهەکان پاکی یان بکاتەوە بۆ ئەوانیش هەیە عەزابێکی بەئازار:

((یەکیان)): پیاوێکە لەپێویستییەکانی خۆی زیاتر ئاوی هەبێ لەسەر ڕێگا ئاوە زیادەکە لە کاروانچی یانو ڕێبواران قەدەغە بکا.

((دووەم)): پیاوێکە موعاهەدەی لەگەڵ ئیمام و پاشای ئیسلام نەکا بۆ خاتری ماڵی دونیانە بێ ئەگەر ماڵی دونیای پێ بدا پێ رازی بێو بۆی مۆر بکا کە پاشا بێ. ئەگەر پێشی نەدا رقی لێ دەبێتەوەو رازی نەبێ بەپاشایەتی‌یەکەی.

((سێیەم)): پیاوێکە بۆ هەڵستاندنی قیمەتی کوتاڵی خۆی و بۆ تەرەقی پێکردنی قیمەتی سوێند بخوا بڵێ بەحەقی ئەو زاتەی کەهیچ مەعبودی حقیقی نی‌یە ئەونەبێ ئەمەندە ئەمەندە پارەیەم بەم کوتاڵە داوە یا خۆ بڵێ ئەمەندە ئەمەندە پارەیەی پێ دراوەبەم کوتاڵە پیاوەکەی کڕیاریش پێی باوەڕ بکا. بەو نرخەی کە فروشیارەکە دەیەوێ. پاشان پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە﴿ان الذين يشترون بعهد الله وايمانهم ثمنا قليلا﴾

(ش) هەرچەندە لەم حەدیثە دا هاتووە لەسەر ژمارەی سێ. لە حەدیث منافی ئەوە نی‌یە کە زیاتر بێ لە سێ. تەفسیری ئەم ئایەتەش لە پێشەوە رەت بوو. ئەوەی قەدەغە کراوە ئاوی زیادە مەنعی ئەصلی ئاو نی‌یە بەلام شافعی‌و حەنەفی گوتویانە سەرف گردنی ئاوی زیاد بۆ کشتوکاڵ واجب نی‌یە بەلام بۆ حەیوان وانسان‌و تێنوو واجبە ئەگەر خاوەنی ئاو نەهێڵێ کوشتاری لەگەڵ دەکرێ‌و بکوژرێ خوێنی موهەدەرە وە ئەگەر ئەوەی ئاو داوا دەکا بکوژری تۆڵەو قیصاصی هەیە.

٦٢٣- ((عن ابى هريرة ﷺ بَيْنا رَجُلٌ يَمْشي فاشْتَدَ عَلَيْهِ العَطَشُ فَنَزَلَ بِئْراً فَشَرِبَ مِنْها ثُمَّ خَرَجَ فَاِذا كَلْبٌ يَلْهَثُ يأكُلُ الثرى مِنَ العَطَشِ فَقَالَ لَقَدْ بَلَغَ هذا مِثل الذي بَلغَ بي فَمَلأَ خُفَهُ ثُمَّ اَمْسَكَهُ بِفِيه. ثُمَّ رقى فَسَقى الكَلْبَ فَشَكَرَ اللهَ لَهُ فَغَفَر لَهُ قالوا يارسولَ اللهِ وانَّ لَنَا فى البَهائِمِ اجْراً قَالَ فى كُلِ كَبِدٍ رَطْبَةٍ اجْرٌ)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوەلە ئەبوو هوریرەﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی وەقتێك پیاوێك دەرۆیشت زۆری تێنوو بوو گەیشتە بیرێك چووە نێو بیرەکە ئاوی لێ خواردەوە پاشان هاتە دەرێ لەناکاو دیتی سەگێك زمانی داهێشتووە لە تێنان خاك دەخوا. پیاوەکە دڵی پێی سووتا گوتی موحەقەق ئەم سەگە لە تێنان وەکو منی بەسەر هاتووە. دوو بارە شۆر بووە نێو بیرەکەی لنگە کەوشێکی خۆی پڕ ئاوکرد بەدەمی خۆی گرتی چونکی دەستەکانی لە کار دابوون بۆ سەرکەوتن پاشان هاتە دەرێ و دەرخواردی سەگەکەیدا خودای گەورە پەسەندی کردوو پاداشت دانەوەی ئەم پیاوەی لای ئەم مەلائکە بەدیار خستو بردیە ناو بەهەشت لە پاش لێ خۆشبوون. ئەصحابە بەرێزەکان کە یەکێك لەوان(سوراقەی کوڕی مالك کوڕی جەعثم بوو). گوتیان چما ئێمە لە ئاودانی حیوانات خێرمان هەیە. فەرمووی لە هەموو جیگەرێکی زیندوو کە بەئاو تەڕ ببێتەوەخێر هەیە با کافریش بێ.

(ش) ئەوەوی گوتیتی هەموو ئەم حەدیثە تایبەتە بەحەیوانی موحتەرەم کە ئەولا نەبێ بکوژرێ. ئاو پێ دانی خێرە ئاو پێدانی الحاقی ئاو کراوە طەعام پێ دانیشی ئەم حەدیثە هان دان هەیە لەسەر چاکەکردن وە ئەوەش دەگەیەنێ ئاو لە گەورەترینی خێرانە. دەگێڕنەوە لە هەندێ تابعینﷺ ئەگەر کەسێك گوناهی زۆر بن بائاو زۆر بداتە خەڵکی. چونکی پاداشتو ثەوابی زۆر گوناهی زۆر ناهێڵی.

٦٢٤- ((عن ابي هُرَيْرَةَ ﷺ والّذى نَفْسِى بِيَدِهِ لأذودَنَّ رِجالا عَنْ حَوْضِي كَما تُذادُ الغَريبَةُ مِنَ الابِلِ عَنِ الحَوْضِ)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبوو هوریرەﷺ گوتی پێغەمبەرﷺ بەحەقی ئەو زاتەی کە روحی منی بەدەستە کە خودای گەورە جل جلالە بەموحەقەقی دەردەکەم لەقیامەت چەند پیاوان لە حەوزی خۆم کە لە رووباری کەوثەرەوە ئاوی بۆ دێ. چلۆنێك ووشتری غەریبی بێ ماخۆ دەردەکرێ لەناو ووشترانی خۆیی لەسەر حەوزی ئاویان.

(ش) مەبەست لەو پیاوانەی دەردەکرێن لەسەر حەوزی پێغەمبەرﷺ مونافقو موبتەدع و مورتەدەکانن(واتە دووروودا هێنەری شتی خراپو هەڵگەرایەوە لەدین).

یا خۆ ئومەتەکانی پێغەمبەرانی پێشوون. بۆیی دەردەکرێن هەتا بۆ سەر حەوزی خویان بچن. چونکی لای قەولی ئەصەح بۆ هەر پێغەمبەرێك حەوزێکی تایبەت بۆ ئومەتەکەی هەیە.

٦٢٥- ((عن الصَّعْبِ ابنِ جُثامَةَ ﷺ لا حِمى الا لِلهِ وَلِرَسُولِهِ)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە صەعبی کوڕی جوثامەﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی هیچ پاوان نییە بۆ خوداو پێغەمبەری خوداو خەلیفەی ئیسلام نەبێ. یەعنی تەنیا بۆ ئەمانە هەیە [illegible] بەپاوان. وە قەدەغە بێ کە حەیواناتی لێ بلەوەڕێ بۆ غەیری ئەمانە نییە. دۆلو هەورازو نشێوی کێوان بکە نە ملکی خۆیان و لێ نەگەرێن. حەیواناتی خەڵکی لێ بلەوەڕێ بۆ فرۆشتن نەبێ. هۆی گوتنی ئەم حەدیثە لە زەمانی جاهلییەت وەکو یەکێك لە ئەشراف لە عاردێك دا بیبەزیبوایە. ئەمەندەی دەنگی سەگ

برۆیشتایە بۆ خۆی پاوانی دەکرد حەیواناتیشی لە عاردی خەڵکی دەلەوەڕاند ئنجا بۆ لاچوونی ئەم عادەتە پیسە ئەم حەدیثە هاتووە.

٦٢٦- العن ابی هریرة ﷺ الخَيْلُ لِرَجُلٍ اجْرٌ وَلِرَجُلٍ سِتْرٌ وَعلى رَجُلٍ وِزْرٌ. فامّا الذی لَهُ اجْرٌ فَرَجُلٌ رَبطَهَا فی سَبيلِ اللهِ. فاطَالَ لَها فی مَرْجٍ أو رَوْضَةٍ فما اصابَتْ فی طَيِّها ذلكَ مِنَ المَرْجِ والرَّوضَةِ كانَ لَهُ حسَناتٍ ولَو انّه انقَطَعَ طَيَّها فاسْتَنَّتْ شَرَفا او شرفين كانَتْ آثارُها وارواثها حسناتٌ لَهُ. ولَو انها مَرَّتْ بِنَهْرٍ فَشَرِبَتْ مِنْهُ ولَمْ يَرُدْ أن يَبْقي كانَ ذلكَ حسناتٍ لهُ فَهِيَ لذلك اجرٌ وَرَجُلٌ رَبَطَهَا تغَنِّيا وَتَعَفُفاً ثُمَّ لَمْ يَنْسَ حَقَّ اللهِ فی رِقابِها ولا ظُهورِها فَهِيَ لذلكَ سِتْرٌ وَلِرَجُلٍ رَبَطَهَا فَخْراً وَرِياءً و نواءً لأهلِ الاسلامِ فَهِيَ على ذلك وِزْرٌ. وَسُئِلَ رسولُ اللهِ صلى الله تعالى عليه وسلم عن الحُمُرِ فَقَالَ ما انزلَ عليَّ فيها شَيْءٌ الا هذه الايةُ الجامعةُ الغاذة﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقالَ ذرة خَيْراً يَرَهُ وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقالَ ذَرَّةٍ شَراً يَرَهُ﴾.

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبوو هوریرە ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی ئەسپ و ماین راگرتن بۆ پیاوێك پاداشتو خێری ئاخیرەتە. بۆ پیاوێکیش داپۆشەرە بۆ حاڵی فەقیری. بۆ پیاوێکیش باری گوناهە لەسەری. ئنجا بۆ ئەو کەسەی پاداشتو ثە وابە پیاوێکە ماینو ئەسپی راگرتبێ بۆ جیهادی کافران لە رێگای خودا ئنجا رای بتەولێنی بەرستەیەك لە مێرگێک پاشان بە درێژایی رستەکە بەمقداری ئەوەی کە ماینەکە لێ دەلەوەڕێ خێرو چاکەی بۆ هەیە. ئەگەر رستەکەش پسا ئنجا راپەڕی بەهەوەس سەرێك دوو سەر هەتا دوا سنووری مێرگەکە. هەندەی هەموو شوێنی سمەکانی کە غاردانی پەیدا بووە. وە هەندەی چەند تەرسی کردوویەتی لە کاتی غاردان لە حاڵی تێری خێرو چاکەی بۆ هەیە. وە ئەگەر ماینەکە رەدبوو بۆ سەر رووبارێك ئنجا لە ئاوی رووبارەکەی

خواردەوە. پیاوەکەی خاوەنیشی نەی دەویست ئاوی بدا خواردنەوەی مایندکە بۆ خاوەنەکەی دەبتە چاکەو حەسەنات. ئنجا ئەم ولاغە لەبەر ئەم شتانەی باسمان کرد پاداشتەو چاکەیە. وە ئەو پیاوەی کە وولاغ رادەگریٚ لەبەر خاتری بیٚ نیاز بوون لە عالەمو چاوی لە دەستی کەس نەبیٚ بۆ کشتوکاڵو بازرگانی خۆی سواری ببیٚ وە حەقی خوداش کە زەکاتە لە بیر نەکا لە بازرگانیو کشتوکاڵ. وە دەرحەق بە پشتی وولاغەکەش حەقی خوا لە بیر نەکا. بەم تەرزە بۆ اطاعەی خودا سواری ببیٚ. وە باریشی نەکا لە تاقەتی خۆی زیاتر. ئنجا لەم وولاغەش لەبەر ئەم شتانەی باسمان کرد داپۆشەرە بۆ هەژاریو حاڵی صاحبی خۆی.

((سیٚیەم)): کە وولاغ ببیٚتە گوناهو بارگرانی وولاغی راگرتبیٚ بۆ خۆهەڵکێشان وریا یەعنی لەپێش چاوان بۆ خۆ پەرستی بیٚ. ناوەوەش بۆ بەجیٚ گەیاندنی ئارەزووی نەفسی بیٚ وە بۆ عەداوەتی ئیسلامانی راگرتبیٚ ئنجا ئەم وولاغەش لەبەر ئەم شتانەی باسمان کرد گوناهەو بارگرانییە.

صەعصەعەی کوڕی ناجیەی باپیری فەرەزدەق لە پێغەمبەری پرسی گوتی ئەی پێغەمبەری خودا گوتی خێری کەر (حمار) چیە؟ پێغەمبەر فەرمووی دەرحەق بە کەر هیچم بۆ نەهاتووە لە ئایەت. ئەم ئایەتە نەبیٚ کە هەمووی دەگرێتەوە جامعو شامله لە گەیاندنی مەعنای زۆر ﴿فمن يعمل مثقال ذرة خيرا يره ومن يعمل مثقال ذرة شرا يره﴾. ئەم ئایەتە گشتییە وا بۆمان ساغ دەبێتەوە کە هەر کەسێك چاکە لەگەڵ کەریش بکا ئە وابی (پاداشتی)چاکەکەی خۆی لەقیامەت پیٚ دەگا. هەرکەسێکیش خراپەی لەگەڵ بکا بەم تەرزە لەفەوقی تاقەتی خۆی باری بکا. جەزای خراپەکەی لە ئاخیرەت پیٚ دەگا.

٦٢٧- ((عن أنس ﷺ سَتَرَونَ بعدي أَثَرَةً فاصبروا حتى تَلقَوني)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەنەس ﷺ گوتی پێغەمبەرﷺ ئیرادەی فەرموو هەندێ زەوی بە موقاطەعە بداتە ئەنصار (یەعنی هەندێ عاردیان بۆ دابڕی و بۆ زراعەت و کشتوکاڵ لە ناحیەی بەحرەین کە مەشهورە. ئەنصار پێیان فەرموو عارد بۆ ئێمە دا مەبڕە هەتا بۆ برایانی موهاجریش دانەبڕی وەکوو ئێمە. پێغەمبەریش ئەگەر چی هەربەم وەڵامەی ئەنصار دڵ خۆش بوو بەڵام هیچ عاردی تریشی شك نەدەبرد کە بداتە مهاجرەکان. پێغەمبەر فەرمووی ئەی ئەنصار لەمەپاش دەبینن لەپاش وەفاتی من. عالەمێك ئەوان هەڵدەبژێردرێن. لەسەر ئێوە لە کارو باری دونیا وە خۆیان بەپێش دەخەن لەسەر ئێوەو هیچ بەشێکتان بۆ دانانێن لە کاروباری ملك و دونیا ئنجا صەبر بگرن هەتا مولاقاتتان لەگەڵ من دەبی لەبەهەشت لەسەر حەوزی رووباری کەوثەر. لەم حەدیثە گەورەییەك هاتە بەر چاو بۆ ئەنصار ﷺ چونکی بەبێ موهاجرەکان هیچ شتێکیان هەڵنەدەبژارد لەماڵی دونیا. و زاندراش خەلافەت و سەلطەنەت قەت لە ئەنصار نابێ. چونکی خستنی یە ژێر باری صەبر تا رۆژی‌قیامەت. صەبریش بۆ ئەو کەسەیە بکەوتەژێربارو مەغلوب بێ. زاندراش لەم حەدیثە ئیمامی ئیسلام بۆی هەیە عارد بداتە هەر کەسێکی کە بییەوێ بۆ کشتوکاڵ کە بەرهەمی هەبێ. نەك بە ملکایەتی بەشەرع ئەمە پێی دەڵێن عارد دا بڕین (اقطاع) نەیشدیتراوە. یەکێك لە زاناکانی مەزهەبی شافعی باسی کردبێ.

٦٢٨- ((عن عبدالله ابن عمر ﷺ قَالَ سَمِعْتُ رَسولَ الله ﷺ يَقول مَنْ ابْتاع نَخْلاً بَعْدَ ان تُؤَبَّرَ فَثَمَرتها للبائع الا انْ يَشْتَرِطَ المُبْتاع وَمَنْ ابْتاعَ عَبْدا وَلَهُ مالٌ فَماله للَّذي باعَهُ الا انْ يَشْتَرِطَ المُبْتاعَ)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە عەبدوالله ی کوڕی عومەر ﷺ گوتی بیستم لە پێغەمبەری خود ﷺ دەی فەرموو هەرکەسێك دارخورما بکرێ لەپاش تەئبیر(یەعنی لەپاش شەق کردنی پشکۆژەی دار خورمای مێ یەو تۆزپێ وەرکردنی‌دار خورمای نێرە بە جێگای شەق کردنەکە بۆ خاتری بەرگرتن). بەری دارخورمایەکەی مێیە بۆ فرۆشیارە مەگەر کڕیار بەو مەرجە لێی بکرێ کە بەرەکەی بۆ ئەو بێ. وە هەر کەسێکیش بەندەیەك بکرێ مالی هەبێ مالەکەی بۆ فرۆشیارە مەگەر کڕیار بەمەرجی مالەکەیەوە بیکرێ.

(ش) چونکی بەندە(عەبد) نابێتە خاوەنی هیچ شتێك. چونکی خۆی مەملوکە مەملوکیش نابێ بە خاوەن مولك. ئیمامی ئەعزەم بەمە حوکمی کردووە. بەلام ووتەی قەدیمی شافعی ئەگەر گەورەی عەبد شتێك بە ملکایەتی بداتە عەبد ئەبێ بە خاوەن ئەمە لای امامی مالك وامامی احمدیش هەر وایە. چونکی لەم حەدیثە اضافەی مالٌ کراوە وەبال عەبد فەرمووی(وله مالٌ) بەلام وەکو فرۆشرا مالەکەی بۆ فرۆشیارە لەلایەن امامی ئەعزەم وەلام دراوەتەوە. قسە لەم حەدیثە بۆ تەملیك نی‌یە. بەلکی بۆ امتناع‌و اختصاصە وەکوو (السرج للفرس والحبل للدابة) لای راسترینی قسەی امامی شافعی ئەوەیە ئەگەر عەبدێك فرۆشرا شمەکەکەی لەگەلْ فرۆشتنەکەدا نی‌یە هەر لە مولکایەتی فروشیارە لای وەجهی دووەمی لەگەلْ فرۆشتنە. لای وەجهی سێیەمی ئەوەیە ئەوەی عەورەتی دادەپۆشی لەگەلْ فرۆشتن دایە بەس. ئەوانەی لەسەر قسەی ئیمامی مالکن ئەلێن ئەو شمەکەی‌کە لە بەریتی بۆ ئیش‌و کار لەگەلْ فرۆشتن

حەنەوانەی لەسەر قسەی ئیمامی حەنبەلی گوتویانە شمەکی عادەتی کە عەبدەکە لە حریتی لەگەڵ فرۆشتن دایە.

ئەگەر عەبدێك دیناری هەبێ قیمەتەکەشی دیناری بێ یا درهەمی هەبێ قیمەتەکەشی درهەم بی موشتەریش بەم شەرتە کڕی کە پارەکەش بۆ ئەو بێ فرۆشیاریش موافەقەتی کرد لای ئیمامی حەنەفی وشافعی ئەم فرۆشتنە راست نییە چونکی ربای تیا هەیە.

# ((كتاب الاستقراض والحجر والتفليس))

# ((باسی قەرزو گل دانەوەو هیچ پێ نەماو))

استقراض: لە زمانی عەرەب بەمانا داواکردنی قەرزە: قەرضیش بەمەعنا قەطعە وتە بڕین. لە اصطلاحی ئەهلی شەرع بەمەعنا تەملیکی شتێکە لەسەر ئەمە کەڕەدی بەدەلی بکرێتەوە. ئەهلی حجاز پێی دەڵێن(سلف) بۆیێ بەم تەملیکە دەڵێن قەرض چونکی مقترض پارچەیەك لەماڵی خۆی قەطع دەکاو دەبڕێ بۆ ئەوەی لێی قەرزدەکا.

حجر) لای ئەهلی شەرع مەنعی تەصەڕوفە لەماڵ واتە گل دانەوەی ماڵە ناهێلی خاوەنەکەی سەرفی بکا.

((تەفلیس)): بە شەرع دەست بەسەرداگرتنی حاکمە لەسەر موفلیس کە لە زمانی عەرەب بەواتا موعسیرە لەم سێ باسە بۆیە لێرە کۆکراوەتەوە چونکی پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە حەدیثیش کەم دەربارەیان هاتووە.

٦٢٩- ((عن ابي هريرة ﷺ مَنْ أخَذَ أموال الناس يريد أدائها أدى الله عنه ومن أخذها يريد اتلافها اتلفه الله)).

**تەرجەمە**

دەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرە ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی هەرکەسێك وەربگرێ ماڵی خەڵکی بەشێوەیەك لە شێوەکانی کڕین و فرۆشتن چی بەقەرد چی بە غەیرە قەرد ئیرادەیشی وابێ کە بیداتەوە. خودای گەورە بۆی دەداتەوە یەعنی خوە ئەسبابی دانەوەی بۆ ئاسان دەکا. هەرکەسێکیش وەری بگرێ بیەوێ بیفەوتێنی لەخاوەنەکەی وە لە کیسەی بچی و زەرەری لێ بکەوێ ویەس. خودا مەعیشەتی ئەو دەفەوتێنێ و ماڵەکەی زوو لەدەست دەچێ و کەڵکی لێ نابینی چونکە نیەتی خراپە وەقەرزەکەشی هەر لەسەر دەمێنێ و رۆژی قیامەت تووشی عیقابو تۆڵەدەبێ دەگێڕنەوە لە ئەبوو ئیمامە بەمەرفوعی((من تداين بدين وفى نفسه وفائه ثم مات تجاوز الله عنه وأرضى غريمه بما شاء. ومن تداين بدين وليس فى نفسه وفائه ثم مات اقتص الله تعالى لغريمه يوم القيامة)).

ئەم حەدیثە پاڵپشتە (مؤيدة) بە حەدیثی مەرفوعی ئەبوو ئیمامە واتە حەدیثی(٦٢٩).

٦٣٠- ((عن أبي ذر ﷺ ما أحِبُ أنَه تحوَّل لى ذهباً يمكُثُ عِندي منه ديناراً فوقَ ثلاثٍ الا دينارٌ أرصِدُهُ لِديْنٍ. ثم قال ان الأكثرينَ مالاً هُمْ الأقلونَ الا مَنْ قَالَ بالمالِ هكذا وهكذا وأشارَ بَيْنَ يَدَيْهِ وَعَنْ يَمِينِهِ وعَنْ شِمالِهِ و قَليلٌ ماهُمْ وقالَ مَكانَكَ وَتَقَدَّمَ غيرَ بعيدٍ فسَمِعْتُ صَوْتاً فاردْتُ أن آتِيَهُ ثم ذكرتُ قوله مكانَكَ حتَّى آتِيكَ فلمَّا جاءَ قُلْتُ يا رسولَ اللهِ الذي سَمِعْتُ أو قالَ الصَّوتُ الذي سمعتُ قال وَهَل

سمِعتَ قلتُ نعم. قال أتاني جبريل عَلَيْهِ الصَّلاة والسلام فقَاْلَ مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِكَ لايُشْرِكُ باللّهِ شَيْئا دَخَلَ الجَنَّة قلتُ وان فَعَل كذا وكذا قَاْلَ نَعَم».

ئەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبو ذەر جووندبی کوڕی جەنادەی غیفاری ﷺ گوتی لەخزمەت پێغەمبەر بووم ﷺ وەکوو چاوی بەکێوی ئوحود کەوت فەرمووی پێم خۆش نی‌یە کێوی ئوحود بۆم ببیّ لە زێر. دەوام بکالای من لەو زێرە دینارێك لە سێ رۆژ زیاتر یەك دینار نەبێ کە بۆ ئەدای قەرز دا بنێم (ئەمە دەلیلە لەسەر اهتمام بە ئەدای قەرز).

پاشان فەرمووی بەڕاستی ئەوانی ماڵیان زۆرترە ئە وابیان کەمترە مەگەر دەوڵەمەنێك نەبێ ماڵ ببەخشێ بەم لایەداو بەو لایەدا. بەهەردوو دەستی پیرۆزی ئیشارەی بۆ لای پێشەوەو چەپو راست دەکرد (یەعنی ئەو کەسانە نەبن کەماڵی خۆیان لە رێگای خێرو صەدەقە سەرف دەکەن ئەوانیش کەمن).

فەرمووی لە جێگای خوت بە تا دێمەوە لات کەمێك بۆ لای پێشەوە لەمن دوور کەوت. گوێم لە دەنگێـك بوو ئیرادەم کرد بۆ خزمەتی بچم. پاشان کەوتەوە یادم فەرمووی لەجێگای خۆت مەبزووە هەتا دێمەوە لات. پاشان وەکوو هاتەوە عەرزم کرد ئەی پێغەمبەری خودا گوێم لە دەنگێک بوو ئەمە چی‌بوو. فەرمووی چما تۆ هیچت گوێ لێ بوو؟ گوتم بەڵێ: فەرمووی جوبرائیل سەلامی خوای لێبێ هاتە لام پێی گوتم هەرکەسێك مرد. لە ئومەتی تۆ هیچ شتێکی نەگیرابێ بە هاوبەش‌و شریك بۆ خودا دەچێتە ناو بەهەشت: گوتم ئەی جوبرائیل ئەگەر زیناو دزیشی کردبێ. گوتی ئەگەر زیناو دزیش کردبێ دەچێتە بەهەشت بەبێ ئەوەی عەزاب بدرێ ئەگەر خودا عەفوی کردبێ ئەگەر نا پاش عەزاب دەچێتە بەهەشت.

٦٣١- ((عن ابي هريرة ﷺ ما مِنْ مُؤْمِنٍ الا وانا أَوْلى بِهِ في الدُنياوالآخِرَةِ اقْرَوُا انْ شِئْتُمْ. النبى أَوْلى بالمؤمِنينَ مِنْ انْفُسِهِم فأيُّما مؤمنٍ ماتَ وَتَرَكَ مالا فَلْيَرِثْهُ عُصبَتُهُ مَنْ كانوا وَمَنْ تَرَكَ دَيْناً او ضياعاً فليأتِنِى فأنا مَولاهُ)).

### تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە ﷺ بەڕاستی پێغەمبەرﷺ فەرمووی نییە هیچ ئیماندارێك الا مەگەر من لایق ترم بۆ ئەو لە هەموو کەسێك لە هەموو کاروباری دونیاو قیامەت هەتا لە رووحی ئەوانیش بۆ ئەوان باشترم. بخوێننەوە ئەگەر حەزدەکەن ئایەتی ﴿ النبي أولى بالمؤمنين من انفسهم ﴾ لە سورەتی ئەحزاب. ئنجا هەر ئیماندارێك مردوو ماڵیشی لەپاش خۆی بەجێ هێشت. با میرات گرەکانی مردوو میراتەکەی لێ بگرن جا هەر نەوعە میرات گرێك بن. وە ئەگەر کەسێکیش قەردو عائلەو منداڵی موحتاجی لەپاش بەجێما با خاوەن مردووەکە بێتە لای من. من خاوەنی کاروباری ئەوم قەردەکانیش دەدەمەوەمناڵەکانیش بەخێو دەکەم.

٦٣٢- ((عن المغیرة بن شعبة ﷺ ان الله حَرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقوقَ الامَّهاتِ ووأْدِ البناتِ وَمَنْعٍ وَهاتِ وَكَرِهَ لَكُمْ قيلِ وقال. وَكَثْرَةُ السُؤالِ واضاعَةُ المالِ)).

### تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە موغیرەی کوڕی شوعبەی کوڕی مەسعودی ثەقەفی ئەصحابەی بەناوبانگ لە پێش حودیبە موسوڵمان بوو. والی بەصرە بوو لەپاشان بوو بەوالی کوفە لە ساڵی پەنجای کۆچی وەفاتی کرد ﷺ گوتی پێغەمبەرﷺ فەرمووی خودای گەورە حەرامی کردووە لەسەر ئێوە ئەزیەت دانی دایکان (ئەزیەت دانی باوکانیشی ئەگەر چی حەرام کردووە بەڵام باسکردنی دایکان بەتایبەتی لەبەر زەعیفی دایکە)خودا حەرامیشی کردووە لەسەر ئێوە کچ لە ژێر خاك نانتان وەکوو لەدایکدەبوون بەزیندوو (یەکەم کەس کە ئەم عادەتە پیسەی لە ناو عەرەب دانا قەیسی کوڕی عاصی تەمیمیبوو. چونکی

دوژمن هاته سەری کچێکیان بەئەسیر برد. دوژمنەکەی کچەکەی لە خۆی مارە کرد پاشان وەکوو صولحیان کرد کچەکەی مێردەکەی خۆی هەڵبژاد نەگەڕاوە لای باوکی. ئیتر قەیس سوێندی خوارد هەرکچێکی ببیی بە زیندوو لە ژێری عارد بیشێریتەوە. عەرەبیش چاویان لە ئەوکرد)

وەحەرامیشی کردووە لە ئێوە مەنعی واجبات لە حقوق وە وەرگرتنی ماڵی حەرام وەپێشی ناخۆشە زۆر پرسیار کردن لە زانین بۆ تاقی کردنەوەو موجادەلەو خۆهەڵکێشان. یا پرسیاری مال لە خەڵکی. وە پێشی ناخۆشە بۆ ئێوە ماڵ بەفێرۆدان. بەم تەرزە اسراف بکەی بۆ زۆر کردنی خواردنی خۆش وجلکی جوان یا خۆ رازاندنەوەی ماڵ بەقاپو قاچاغو خانو بەزێروزیو. چونکی خودای گەورە ماڵی داناوە بۆ بەرێوەبردنی کاروباری خەڵك لە پەرت کردنی ماڵیش زەرەر هەیە بۆ بەرژەوەندیو مەصالحی خەڵك.

# (( باب الخصومات ))

# (( باسی ناكۆكی ))

٦٢٣- ((عن عبدالله بن مسعود ﷺ قالَ سَمِعْتُ رَجُلاً يَقْرأُ آيةً وَسَمِعْتُ مِنْ رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم خِلافَها فَأَخَذْتُ بِيَدِهِ فَأَتَيْتُ بهِ رسول الله صلى الله تعالى عليه وسلم. فَقالَ كِلاكُما مُحْسِنٌ فَلا تَخْتَلِفوا فانَّ مَنْ كَانَ قَبْلَكُم اختَلَفوا فَهَلَكُوا)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لەعبدالله ی کوڕی مسعود ﷺ گوتی گوێم لە پیاوێك بوو لە سورەی الرحمن نەك لەسەر شێوەی بیستنی خۆم لە پێغەمبەرﷺ دەی خوێند منیش دەستم گرت بردمە خزمەت پێغەمبەرﷺ فەرمووی خوێندن و قرائەتی هەردووکتان باشە. با ناکۆکیتان نەبێ دەرحەق بە قورئـان لەسەر وەجهی موجادەلەو خۆ گەورە زانین. چونکی هەر لەفزێك لە قورئان کە بەدوو سێ وەجهەو شێوە هاتبێ بە انکاری کل وەجهێك لە وجوهی نازلە. کافردەبی. بۆیێ پێش ئێوە وەکوو لەبەر ناتەبایی خۆیان ناکوکی‌یان بوو لە کەلامی خودا کافر بوون وبەهیلاك چوون. لە ریوایەتێکی تر بەزیاد لەسەر ئەم حەدیثە هاتووە. ((لا تختلفوا ان هذا القرآن أنزِلَ على سبعة احرف فلا تماروا في القرآن فان المراء فية كفرا)). یەعنی قورئان هە ناردراوەتە خوارێ لەسەر حەوت لوغەتی ئەهلی حیجاز:

یەکێکیان: قورەیش

دووەم: تەمیم

سێیەم: صنەبە.

چوارەم: کنانە

پێنجەم: قەیس

شەشەم: هُذَیل

حەوتەم: بەنو ئەسەد.

پاشان خوێندنی قورئان بەم حەوت لوغەتە لە حەدیثی موعەن عەن بەتەواتر نۆ کەس لەئیمامە بەرێزەکان وەریان گرتووە.

١- نافعی کوڕی رونەیم.

٢- یەزیدی کوڕی قەعقاع لە مەدینە.

٣-عبدالله کوڕی کەثیر لەمەکە.

٤-ئەبو عەمری کوڕی عەلاء.

٥-یەعقوبی حەضرەمی لە بصرە.

٦-عاصمی کوڕی ئەبی نجود.

٧-حمزە کوڕی حەبیبی زەیات.

٨-عەلی کسائی.

٩-خلف بزازیش لە کوفە.

ئەم نۆ کەسانە لەسەر قرائەتی سەبعەن بەلام قرائەتی جەعفەر وخلاد بە تەواتور نیيە بەڵکی لە حەدیسە کانی مەشهورو دیاریان وەرگرتووە هەتا قیرائەتی عەشرە ئنجا لای ئیمامی شافعی تەنیا بە قیرائەتی سەبعەی متواتیرە نوێژ دروستە چونکی گوتیتی زیاد لە حەوت قیرائەتی مەشهورە شازەیە(دەگمەنە). بە شازەش نوێژ دروست نیيە. ئیمامی حەنەفی گوتیتی ئەم دە قیرائەتە هیچیان شازە نین نوێژ بە هەموویان دروستە. قیرائەتی شازە ئەم قیرائەتانەن کەلەسەرەوەی قیرائەتی عەشرە بێ یەکێکی تریش بە اتفاق نووسینی قورئان نابێ مخالفێ نووسین و ئیملای مەصحەفی ئیمامی عوثمان بێ.

٦٢٤- ((عن أبي هريرة لا تخيروني على موسى. فان الناس يَصْعَقُونَ يوم القيامة فاصعَقُ معهم. فأكونُ أولَ من يُفيقُ فاذا موسى باطش جانب العرش فلا أدرى أكان فيمن صَعِقَ فأفاق قبلى أو كان مِمَّن استثنى الله)).

**تەرجەمە**

دەگێرنەوە لە ئەبو هورەیرە ﷺ ئەبو بەكری صدیق و فنخاص جوولەكە جوێنیان بەیەكتری دا. حەزرەتی صدیق فەرمووی سوێندم بەو زاتەی كە محمدی هەڵبژاردووە لەسەر هەموو عالەم جوولەكەش گوتی سوێندم بەو زاتەی موسی هەڵبژاردووە لەسەر هەموو عالەم. صدیقی ئەكبەر لەپاش سوێندی جوولەكە وەكو تێگەیشت سوێندەكە شاملی كفرێكی گەورە بوو چونكی محمدیش یەكێكە لە هەموو عالەم و موساشی بە گەورەترزانی لە محمد. دەستی بڵند كرد شەقێكی لە رووی فنخاص دا فنخاص بۆ خزمەت پێغەمبەر چوو. بەشكایەت حیكایەتی خۆی وحەزرەتی ئەبوو بەكری گێراوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەدەرەجەیێكیوا. ئەمن هەڵمەبژێرن و ئەمر بەگەورە مەزانن لەسەر موسی كە ببێتە سەبەبی كەمی یەك بۆ موسی وببێتە سەبەبی ناكۆكی. چونكی رۆژی قیامەت هەموو كەس بێ هۆش دەبێ منیش لەگەڵ ئەوان بێ هۆش یەكەم بەسەردا دێ پاشان من لە پێش هەموویان بە هۆش دێمەوە وەكوو دەبینم موسی ﷺ بەهەردوو دەستی توند لایەكی عەرشی گرتووە. ئنجا نازانم عەجەب موساش لەوانەبوو كەبێ هۆش بووە. وەپێش من هەڵستاوەتەوە. یاخۆ یەكێكە لە وانەی كە قورئان موستەثنای كردوون ﴿فصَعِقَ من فى السموات ومن فى الارض الا من شاء الله﴾ هەر بێ هۆش نەبووە.

(ش) لەهەر یەك لەم دوو حالە گەورەیی دیارە بۆ حەزرەتی موسا ﷺ. بەڵام ئەم فەقیرە دەڵێ (واتا وەرگێر) سەبەبی نەهی لە تەفضیلی ئەو تەنیا تەواضع بووە چونكە نقطە ی تواضع ملكەچی لە هەموو ئەحوالی خۆی ملاحظە فەرمووە.

((روحم بە فیدای خاكی سەگی كۆ یی كەسێكە[1]

رووحی بە فیدای خاكی سەگی خادمی ئەو بێ))

دروودی خوای لەسەر ئەوو یارانی ئەو بێ.

---

[1] ئەم تاكە هەلبەستە كاتی خۆی لە دیوانی (فانی) ملا حسین شیخ سعدی بلاوم نەكردووتەوە تكایە ئەوەی ئەم دیوانەی لایە با بنووستەوە (بلاو كەرەوە بشیر حسین).

# (( كتاب اللقطة ))

# باسى هەلگرتنەوە

٦٣٥- ((عن ابي ابن كعب ﷺ عَرِّفْها حَوْلاً فعرَّفتها. فَلَمْ أجِدْ مَنْ يَعْرِفْها ثُمَّ اتَيْتُه. فَقَالَ عَرِّفْها حَوْلاً. فَعَرَّفْتُها فَلَمْ اجِد مَنْ يَعْرِفها ثُمَّ اتَيْتُهُ ثالثاً فَقَالَ احفَظْ وِعائَها. وعدَدَها وَوِكائَها فانْ جاءَ صاحِبُها والا فاستَمْتِعْ بها. قالَ وَجَدتُ صُرةً فيها مائةُ دينار فاتَيْتُ النبى صلى الله تعالى عليه وسلم فَقَالَ لَهُ)).

**تەرجەمە**

دەگێرنەوە لە ئوبەی كوڕی كەعب ﷺ گوتی كیسەیەكم دۆزیەوە (١٠٠) سەد دیناری تیا بوو هێنامە لای پێغەمبەرﷺ فەرمووی بچۆ لەبازارو لەدەرگای مزگەوتان و جێگەی كۆبوونەوەی خەڵكی بانگ رابێلە بڵێ كێ شتێكی بزر كردووە. من دۆزیتمەوە. ساڵێك بانگم راهێشت. هیچ خاوەنی پەیدانەبوو هێنامەوە لای پێغەمبەرﷺ فەرمووی بچۆ. بچۆ بانگ رابێلە ساڵێك ئەمجارەش بانگم راهێشت ساڵێك هیچ كەسێكم وەدەست نەكەوت بیناسێتەوە. جاری سێیەم هێنامەوە لای پێغەمبەرﷺ فەرمووی كیسەكەو ژمارەی پارەكەو دەرك بەستی كیسەكە لای خۆت بناسەو بمێنێ ئەگەر خاوەنی پەیدا بوو بیدەوە. بەڵام لە پاش دیاركردنی ژمارەی پارەكەو ئەوصافی كیسەكەو دەرك بەستەكەی بەبێ شاهیدو بەینە. ئەمە لای ئیمامی مالك و ئیمامی احمد وایە. بەڵام امامی حەنەفی و ئیمامی شافعی ئەوەی هەڵدەگرتەوە دروستە تەنیا لەسەر وەصف كردنی شتەكەبیداتەوە. بەڵام ئەگەر نەیداتەوە زۆری لێ ناكرێ بیداتەوە بەبێ شاهید. چونكە داوای ملكایەتی مالیك دەكا لەدەستی غەیر دایە پێویستی بە شاهیدو بەینە

هەیە لەبەر عمومی ئەم حەدیثە (البینة علی المدعي) کە وایە فەرمان کردن بەدانەوە لەم حە دیثە بەبێ باسکردنی بەینە مەحمولە وەسەر اباحە لەبەر موافەقەت لە بەینی هەردوو حەدیثان. وە ئەگەر خاوەنیش پەیدا نەبوو. بۆخۆت بەکاری بێنە. (بەڵام لە پاش تەمەلوك بەم تەرزە بڵێ کردم بەملکی خۆم. ئنجا ئەگەر بەهیچ جۆر خاوەنی پەیدا نەبوو. لە ئاخیرەت هیچ داواکردنی لەسەر نییە بەمەرجێك عەزمو بریاری لەسەر دانەوەبێ ئەگەر هاتوو خاوەنەکەی پەیدابوو. بانگراهێشتنی سێ ساڵە لەم حەدیثە لەبەر زێدە اهتمامە لەبەکار هێنانی ماڵی دۆزراوەیەوە. ئەگەر نا واجب ساڵێکە بە دەلیلی حەدیثی زەیدی کوڕی خالدی جوهەنی کەباسی کرا لە باسی (علم) واتە زانین.

٦٣٦- ((عن أبي هريرة ﷺ إني لأَتَقَلَّبُ إلى أهلي فأجدُ الثمَرَةَ ساقِطَةً على فراشي فأرفَعُها لآكُلَها ثمَّ أخشى أن تَكونَ صَدَقَةً فأُلقيها)).

**تەرجەمە**

دەگێڕنەوە لە ئەبو هوریرە ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی بەڕاستی من هەندێ جار وا دەبێ لەدەرەوە بۆ ماڵی خۆم دەچمەوە پاشان دەبینم دانە خورمایێك لەسەر جێگام کەوتووە. منیش هەڵی دەگرمەوە کە بیخۆم لەپاشان دەترسێم کە ماڵی صەدەقەو زەکات بێ کە لە من حەرامە ئنجا فرەی دەدەمەوە سەر عارد.

(ش) لەم حەدیثە زاندرا هەرشتێکی وەکوو دانە خورمایێك کە هەرچەندە هێچیش نەبێ. هەرکەسێك هەڵی گرێتەوە. بەبێ بانگ راهێشتن و تەعریف دەبێتە ملکی خۆی. ئەگەر چی هەڵیش گیراوەتەوە بەڵام دروستە تەعریف نەکرێ. چونکی پێغەمبەرﷺ ئەگەر لەترسی صەدەقە نەبوایە دەی خوارد.

# ((كتاب المظالم))

# باسی ستەم

٦٣٦- العن أبي سعيدٍ ﷺ إذا خَلَصَ المؤمِنونَ مِنَ الصِّراطِ المَنْصوب على النارِ. حُبِسوا بِقَنْطَرةٍ بَيْنَ الجنَةِ والنَّارِ فَيَتَقاصَّونَ مَظالِمَ كانَتْ بَيْنَهُمْ في الدُّنيا حَتى إذا نُقُّوا وهُذِّبوا أُذِنَ لَهَمُ بِدُخُولِ الجنَة فوالذى نفسُ محمد صلى الله تعالى عليه وسلم بِيَدِهِ لأحَدُهُمْ بِمَسْكَنِه في الجنةِ أدلُّ بِمَنْزِلهِ كانَ في الدُّنيا وفى رِوايةِ فَيَتَقَاصَّونَ)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی وەکو ئیماندار نەجاتیان دەبێ لە پردی صراط کە لەسەر جەهەنەمە. رادەگیرێن لە پردێك لە بەینی بەهەشت و صراطی راخراو لەسەر جەهەنم لەزوڵم و زۆرداری بەینی خۆیان دەکۆڵنەوە ئەوی لەدونیای دەرحەق بەیەکتریان کردووە بە چاکەو حەسەنات لەجیاتی پارەی دونیا حەقی زوڵموستەمی دونیایان دەدەنەوەیەکتریان بەتۆلە. هەتا پاك دەبنەوەلە گوناهان ئیزن دەدرێن بۆ چوونە ناو بەهەشت. ئنجا بەحەقی ئەو خودایەی کە روحی محمدی بەدەستە. بەبێ شك هەر یەکێك لەوان بۆ جێگاو شوێنی خۆی لە بەهەشت شارەزاترن لەو جێگاو شوێنەی کە لە دونیا هەیانبوو چونکی لە مودەی بەرزخ هەموو هێوارەو سبەینە نیشانیان دراوە. هەرچلۆنی ئاگر نیشانی کافران دەدرێ لە هەموو هێوارەو سبەینان ﴿النار یعرضون علیها غدوا وعشیا﴾.

تێبینی ((ملاحظة))

بەرزەخ: ئەو کاتە یەکە مرۆڤ دەمرێ بەخاکی دەسپێرن هەتا ئەو رۆژی هەڵدەستنەوە بۆ حساب و جەزا کە رۆژی قیامەتە.

٦٣٨- (عن ابن عمر ﷺ إنَّ اللهَ يُدْنِي المُؤْمِنَ فَيَضَعَ عَلَيْهِ كَنَفَهُ وَيَسْتُرَه فَيَقول أتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذا فَيَقُولُ نَعَم أي رَبِّ حَتى إذا قَرَّرَهُ بِذُنُوبِهِ. ورآى في نَفْسِهِ أنَه قد هَلَكَ. قَالَ سَتَرْتُها عَلَيْكَ في الدنيا وأنا أغْفِرُها لَكَ اليَوْمَ. فَيُعْطى كِتابُ حَسَناتِهِ و أمَّا الكافِرُ والمُنافِقُ فَيَقولُ الاشْهادُ هؤلاءِ الذين كَذَبوا عَلى رَبِّهِم الا لَعْنَةُ اللهِ على الظالمين).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە عبدالله ی کوڕی حەزرەتی عومەر ﷺ گوتی بیستم لە پێغەمبەرﷺ دەی فەرموو. رۆژی قیامەت بەتەحقیق خودای گەورە ئیماندار لە خۆی بەنزیك دەخا ئەمجا دەیخاتە ژێر حفظ و پەنای خۆی وە دەی شێریتەوە لە ئەهلی مەوقیف. ئەمجا پێی دەڵێ ئەی عەبدی من. ئەرێ فلان گوناهی خۆت دەزانی فلان گوناهی خۆت دەزانی. عەبدە ئیماندارەکەش بە کەمالی شەرم و شەرمەزاری لە پێش خودای گەورە دەڵێ بەڵێ: ئەی خالق و بەخێوکەری من هەتا ئیقراری پێی دەکا بەهەرچی گوناهی کردوویەتی.

• (ش) چونکی هەموو گوناهەکانی بۆ بەدیار دەخا ونیشانی دەدا. بەناچاری ئیعتیراف بەهەموویان دەکا یەقین حاصل دەکا لەناو دڵی خۆی کە بە راستی بە هیلاك چوو. خودای گەورە دەفەرموێ بۆ خاتری شەرمەزاری عالەم نەبێ. من لە دونیا ئەم گوناهانەی تۆم شاردەوە لەعالەم. ئیمرۆکەش لەگوناهەکانت خۆش دەبم. عەزابت نادەم. ئنجا دەفتەرو خێرو چاکەی کە کردوویەتی پێی دەدرێ. ئەما کافرو مونافق شاهید لە مەلائیکەو پێغەمبەران و ئیماندارانی انسان و ئەجنە. شاهیدی یان

سەردەدەن. دەڵێن ئەمانە ئەو کەسانەن قسەی درۆیان بە بوختان رێك دەخست سەر خودادەیانگوت شریکی هەیەو کوڕی هەیە أعاذنا الله ئاگادار بە لەعنەتی خودا سەر زاڵمانە. ئەم لەعنەتەش قسەی شاهیدانە هەروەکوو لە ئاخیری سوورەی هود ـەفەرمووی﴿ومن أظلم ممن افترى على الله كذبا أولئك يعرضون على ربهم ويقول لاشهاد هؤلاء الذين كذبوا على ربهم الا لعنة الله على الظالمين﴾.

٦٣٩- ((عن ابْنِ عُمَرَ ﷺ المُسْلِمُ أخو المُسْلِمِ لايَظْلِمُهُ ولا يُسْلِمُهُ ومَنْ كانَ فى حاجَةِ أخيهِ كانَ اللهُ فى حاجَتِهِ وَمَنْ فَرَجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللهُ عنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ القِيامَةِ وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِماً سَتَرَهُ اللهُ يَوْمَ القِيامَةِ)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە عبدالله حەزرەتی عومەر ﷺ گوتی بەڕاستی پێغەمبەرﷺ فەرمووی موسوڵمان هەرچی موسوڵمان بی بەموطلە قی جا چی حوڕو ئازاد بێ چی بەندە بێ چی بالغو گەورەبێ چی منداڵ بێ برای موسوڵمانە لەدین. با زوڵمی لێ نەکا چونکی زوڵم کردنی موسوڵمان حەرامە وەبا تەسلیمی ئازارو سەختیشی نەکا. بەڵکی لە کارەسات و موصیبەتان لای بدا. وەهەر کەسێك لەئیش پێك هێنانی برای دینی خۆی بێخودای گەورەش لە ئیش پیك هینانی ئەوە. وەرهەر کەسێك لا ببا لە برای دینی خۆی تەنگاوییێکو غەمێك خودای گەورە لەئەو لا دەبا تەنگاوێکی سەخت لەتەنگاویەکانی ڕۆژی قیامەت. وەهەرکەسێکیش بشێرێتەوە عەیبی موسوڵمانێك (بەم تەرزە گوناهێکی کردبوو لێ ببۆوە) خودای گەورەش عەیبی ئەو دەشێریتەوە رۆژی قیامەت) بەڵام ئەگەر لەسەر گوناهەکە گیرا لێ نەببوە دەبی بەحاکم بڵێ ناشبیتە غەیبەت چونکە ئەمە لە ئامۆژگاری یە پیویستەکانە. ئەم حوکمە بۆ کەسێکە گوناە بەدزی بکات بەڵام کەسێك بە ئاشکراگوناە بکا بۆ ئەو غەیبەت نی‌یە بەدەلیلی حەدیسی

((اترعون من ذكر الفاجر متى يعرفه الناس اذكروا بما فيه يحذره الناس)) كه خاوەنی (تلويح) ريوايەتی كردووه بە اسنادی خۆی لە بەهزی كوڕی حكيم ((الايظلمه ولا يسلمه)) نەهی‌يە لە قالبی نەفی.

٦٤٠- ((عن انس ﷺ انصُرْ اخاكَ ظالماً او مَظلوماً قالوا يارسولَ الله هذه نَنْصُرهُ مَظلوماً فَكَيْفَ نَنْصُرُهُ ظالماً قَالَ تَاخُذ فَوْقَ يَدَيْهِ)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لەئەنەسی كوڕی مالك ﷺ فەرمووی یاریدەری برای دینیت بده چی ظالم وستەم كار بێ چی ستەم لێ كراو بێ ئەصحابی پێغەمبەر گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا یاریدەری برای ستەم كراومان دەدەین بەهەر جۆرێك بێ ئەدی چۆن یاریدەی برای زاڵم وستەمكار بدەین. فەرمووی توند هەر دوودەستی بگرە مەهێڵە زوڵم بكا (لەفظی‌فوق لە حەدیث اشارەیە وە بال اخذ بە استعلاء) یەعنی زاڵم ئەگەر وازی نەهێنا لەزوڵم بەقسە بالفعل قەهرەن واتە بەزۆر مەنعی بكەن لەزوڵم نەوەك تووشی عەزابو عیقابی جەزای زوڵمی خۆی ببێ((یەعنی ئەمە یاریدەدانی زاڵمە))

٦٤١- ((عن ابن عمر ﷺ الظلمُ ظُلُماتٌ يَوْمَ القِيامَةِ)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە عەبداللە ی كوڕی حەزرەتی عومەر ﷺ گوتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی زوڵم كردن یەعنی ماڵبردنی عالەم بەناحەق وە تەعەروز بەناموسو حقوقی خەڵكی)چەند تاریكی‌یەكە رۆژی قیامەت لەسەر زاڵم. هیچ نابینی ئنجا لایقە قاچی بكەوێتە كۆندرێك بڕواتە ناو ئاگر. زوڵم پەیدا دەبی لە تاریكی دڵ چونكی ئەگەر دل

روناك بێ زوڵم ناكا. به روناكی خواناسین پێش خۆی دەبینی تووشی كەندرو عەزابی ئاگر نابی.

٦٤٢- ((عن ابی هریرة ﷺ مَنْ كانَتْ لَهُ مَظْلَمَةٌ لاحَدٍ مِنْ عِرْضِهِ او شَيء فَلْيَتَحَلَّلَهُ مِنْهُ اليَوْمَ قبلَ ان لايكونَ دينارٌ ولا دِرْهَمٌ ان كانَ لَهُ عَمَلٌ صَالح أُخِذَ منهُ بِقَدَرِ مَظْلَمَتِهِ وانْ لَمْ يَكُنْ لَهُ حَسَناتٌ أُخِذَ مِنْ سيئاتِ صاحِبِهِ فحُمِلَ عَلَيهِ)).

**تەرجەمە**

دەگێڕنەوە لە ئەبوو هوریرە ﷺ گوتی پێغەمبەرﷺ فەرمووی هەركەسێك زوڵمێكی كردووە لەیەكێك لە خصوص ناموسی یا خۆ لە خصوص شتێك لە سامان هەتا شەقێكیش با گەردەنی خۆی پێ ئازاد بكا ئیمڕۆ لە پێش هانی رۆژێك نە دیناری لێ پەیدا دەبی نە درهەم ئنجا زاڵم ئەگەر كردەوەی باشی هەبوو لێی وەردەگیرێ لەجیاتی زوڵمی دونیای كە كردیتی وەئەگەر چاكەشی نەبوو لە گوناهەكانی زۆر لێ كراو (مەظلوم) وەردەگیرێ دەخرێتە سەر گوناهەكانی زاڵم.

مازەری گوتیتی هەندێ لە موبتەدیعە گوتوویانە ئەم حەدیثە موعاریضە (واتە پێچەوانەی) فەرموودەی خودایە ﴿ولا تزر و وازرة وزر اخری﴾ ئەمە باطلەو جەهالەتێكی ئاشكرایە چونكی لێرەییش عەزابدرانی زاڵم لەجیاتی مەظلوم هەر لەبەر گوناهەكەی خۆیتی كە زوڵمەكەیە لەخەڵقی كردووە.

(وەرگێڕ) ئەم حەدیسە موناف نییە(واتە پێچەوانە نییە) لەگەڵ ئایەتی ﴿ولا تزر وازرة وزر اخری﴾.

٦٤٣- ((عن سعيد ابن زيد ﷺ مَنْ ظَلَمَ مِنَ الأرضِ شَيْئا طَوَقَهُ مِنْ سَبْع ارَضين)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە سەعیدی کوڕی زەید ﷺ کە یەکێك بوو لەو دەکەسەی مژدەیان پێ دراوە بە بەهەشت کە بە(عشر المبشرة) ناسراون گوتی بیستم لە پێغەمبەرﷺ فەرموو هەر کەسێك بەناحەق عارد لە کەسێك زەفت بکا بە ئەستوورایی حەوت چین لە عارد واتە حەوت طە بەقە ئەوەندەی زەفتی کردووە دەکرێتە خەناوکە لە ملی دەکرێ بە ئازار دانی.

٦٤٤- ((عن ابن عمر مَنْ اخَذَ مِنَ الأرْضِ شَيْئًا بِ غَيْرِ حَقِّهِ خُسِفَ بِهِ يَوْمَ القِيامَةِ الى سَبْعِ ارضين)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە عبداللەی کوڕی حەزرەتی عومەر ﷺ گوتی پێغەمبەرﷺ فەرمووی هەر کەسێك لە عارد وەربگرێ بە ناحەق ڕۆژی قیامەت زەفت کەر (غاصب)بەو عاردەی زەفتی کردوە ڕوو دەبرێتە خوارێ هەتا حەوت طە بەقە لەعارد هەتا جەهەنەم.

(ش) لەم حەدیسە پیرۆزە لای ئیمامی شافعی و امامی احمد دەلالەت هەیە لەسەر امکانی غەصبی عەقار (عارد) کە ضە مانی لی پەیدا دەبی بەڵام لای ئەبوو حەنیفەو ئەبوو یوسف غەصب ڕوونادا لەو ماڵە نەبێ کە دەگوازریتەوە (اموال منقولة) چونکی نەهێشتنی دەسەڵات نەگوازتنەوەیە. گوازتنەوەش لەعارد (عەقار)نییە. کەوایە ئەگەر کەسێك عاردێك غەصب بکا لە پاشان عاردەکەی لەدەست نەما نابێتە ضامن. محمدو ئیمامی شافعی گووتویانە دەبێتە ضامن لەبەر تەحەقوقی اثباتی ید لە غەیری منقولات. ((واتە لەبەر ئەوەی کە دەسەڵات دەچەسپێ لەسەر ئەو شتەی کە ناگوێزرێتەوە)) چونکی قەت ڕێك ناکەوێ کۆ بوونەوەی دوودەستان لەسەر یەك جێگا

ئەیەك حاڵەتدا. وە دیسان دەلالەتیش هەیە چلۆن حوکم موتەعەلیقە بەظاهری عارد. ((واتا بڕیارێکە پەیوەندی بەسەرەوەی عارد هەیە)). موتەعەلیقیشە بەناوەوەی عارد. هەتا بن هەفت طە بەقاتی عارد کە وایە کەسێك کە بووە خاوەنی سەر عاردێك دەبێتە خاوەنی بەردو بیناو مەعدەنەکانیش.

لەمادەی (٩٠٥)نۆ سەدو پێنجی مەجەلە(مجلة الاحکام العدلیة) بۆ مەصالحی خەڵکی قسەی ئیمامی شافعیو ئیمامی محمد اختیار کراوە ئەگەر موراجەعەی بکەی مەصالحەکانت بە دوورو درێژی لیٚ مەعلوم دەبی. (رەحمەتی خوایان لیٚ بێ).

٦٤٥- ((عن عائشة ﵂ ان ابغض الرجال الى الله الألد الخصم)).

**تەرجەمە**

دەگێڕنەوە لە دایکی ئیمانداران حەزرەتی عائشە (رەزای خودای لیٚ بێ) پێغەمبەرﷺ فەرمووی بەڕاستی رك لیٚ بووەترینی پیاوان(مەبغوض ترینی پیاوان)لای خودا ئەو کەسەیە زۆر رشت بی لەسەر ئەو شتەی کە ناحەقەو داوای دەکا بەم تەرزە بەحەقی بزانی ئنجا چونکە کافر دەبیٚ بۆیە أبغضە.

٦٤٦- ((عَنْ أمِّ سَلَمَةَ ﵂ إنَّمَا أنَا بَشَرٌ وَإنَّهُ يَأتِينِي الخَصْمُ فَلَعَلَّ بَعْضُكُمْ أنْ يَكُونَ أبْلَغُ مِنْ بَعْضٍ فَأحْسِبُ أنَّهُ صَدَقَ فَاقْضِي لَهُ بِذَلِكَ فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ مُسْلِمٍ فَإنَّمَا هِيَ قِطْعَةٌ مِنَ النَّارِ فَلْيَأخُذْهَا أوْ فَلْيَتْرُكْهَا)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لەدایکی ئیمـانداران ام سـەلەمە گوتـی پێغەمبـەرﷺ لـە حوجـرەی تایبەتی من بوو لە پێش دەرگە گوێی لە مشتومڕێك بوو تەشریفی بۆیـان هاتـە دەری فەرمووی بەبێ گومان من هەر مرۆڤیکم وانسانێکم لە هەموو کات عیلمی باطن نازانم.

(ش): ئەمە رەدە لەسەر ئەوانەی زەعمیان وایە هـەرچی پێغەمبـەری خـودا بـی هەرکات عیلمی غەیبی هەیە لە موحاکەمات فەرقی ظالم و مە ظلوم دەکا.

دەعواو موحاکەمەشم دێتەلا ئنجا لایقیشە هەندێکتان لە هـەندێکتان قسـەرەوانٕ ترو بلیغ تر بن باشتر ئەو داوایەی دەیکەن رونی دەکەنەوە ئنجا وا تێدەگەم بەڕاسـتی فەصیحە کە لە قسەی خۆی راستو بێ درۆیـە. شـەرع لـەدوو ئـەو دەدەم لەسـەر ئـەو تەقریراتی لێم بیست ئنجا لەموحاکەمە هەرکەسێك من شەرعێکی لە دوو بدەم و حەقی پێ بدەم چی ئیسلام بێ چی ذیمیبێ چی موعاهید بێ لە راستیشـدا ناحـەق بـێ بـەبێ شك ئەم قەضیەی کە لە دەرەوە حەق و لەناوەوە ناحەق بێ بۆ ئـەو کەسـەی شـەرعی لە دوودراوە پارچەیێکە لە ئاگر ئنجا حەزدەکا بـا وەری بگـرێ و عـەزاب بچێـژێ یـاخو تەرکی بکاو نەیەوێو ئەمین بێ لەعەزاب.

(ش) زاندرا لەم حەدیسە حوکمی حاکم با زۆر عـادلیش بـێ حـەرام حـلال ناکـا واجبیشە لەسەر مودەعی یا وەکیلی مودەعـی سـەعی نـەکا بـۆ ابطـالی حـەقو احقـاقی باطل بەلکی هەر هەولی ئەوەبدا حەق بەدیار بکەوێ.

کەچی ئیستا لەم زەمانە چەند پارەو بەرتیل بەمەحامیان دەدەین بـۆ ((ابطـالی حەقو احقاقی باطل أعاذنا الله أعاذنا الله)) واتە خوا بمان پارێزێ خوا بمان پارێزێ.

٦٤٧- (عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ إِذَا نَزَلْتُمْ بِقَوْمٍ فَأَمِرَ لَكُمْ بِمَا يَنْبَغِي لِلضَّيْفِ فَاقْبَلُوا وَإِنْ لَمْ يَفْعَلُوا فَخُذُوا مِنْهُمْ حَقَّ الضَّيْفِ).

**تەرجەمە**

دەگێڕنەوە لە عەقەبەی کوڕی عامری جوهەنی گوتی بە پێغەمبەرمان گوت تۆ ئێمە بۆجێگایان دەنێرێ وە دەبێ لای قەومێك دادەبەزین میوانداریمان ناکەن ئنجا لەمە چی حوکم دەکەی فەرمووی: وەکوو دابەزین لای قەومێك ئەگەر ئەمر کرا بۆتان بەو شتەی کە لە میوان دەوەشێتەوە قبوولی بکەن وە ئەگەر واشیان نەکردمیوانداریان نەکردن حقوقی میوان چەندێکە بەزۆر لێ یان بستێنن.

(ش) لای لیث بە واجبی لێیان دەستێنرێ لای ئەحمەد ئەگەر خەڵکی بادیە بن بەواجبییە ئەگەر خەڵکی گوند بن سونەتە بەڵام مەزهەبی ئەبوو حەنیفەو مالكو شافعی و جمهور ئەم لێ ستاندنە سونەتێکی موئەکەدەیە جەوابیشیان داوەتەوە لەم حەدیسە بەحەمل کردن وەسەر رێبواری ناچار چونکی میوانداری ناچاران واجبە.

بەم حەدیسە بوخاری استدلالی کردووە لەسەر مەسئەلەی ظفر حوکمیشی پێ ی کردووە ئیمامی شافعی بەم تەرزە قەرزار انکاری کرد قازیش بۆی وەرنەدەگرت بەبێ شاهیدو بەیینە مودەعیش شاهیدی نەبوو. فەرموویتی ئەگەر لەجنسی ماڵیخۆی ماوە لێی بستینی. ئەگەر نەشی بوو لەغەیری جنس نەبی جائزە ئەو کاتە. بەڵام ئەگەر ممکن بوو قازی بۆی وەربگرێتەوە بەم تەرزە مودەعا علیە موقیر بوو (دانی پیانا). بەڵام موماطل بوو(واتا هەی بوو بەڵام قەرزەکەی نەداتەوە). یاخو منکر بوو بەیینە هەبوو (انکاری قەرزەکەی دەکرد بەڵام شاهید هەبوو کە قەرزارە) ئایا ئەو کەسەی داوا

دەكا سەربەخۆیە لەوەرگرتنەكە. یا واجبە داوا ببرێتە لای قازی. لای بەشی زۆری شافعییەكان جائزە بالاستقلال أخذ واتە دروستە بەزۆر لە مدینی مماطل وەربگیرێ[٢].

٦٤٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ لا يَمْنَعُ جَارٌ جَارَهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَةً فِي جِدَارِهِ».

تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبوو هورەیرە ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی جیران جیرانی خۆی قەدەغە ناكا كە خانوویان پێكەوە نووسابێ كە شەپكە دارێك دانی لەناو كۆنو دەرەزی دیوارەكەی یەعنی لەناوی را بكا.

(ش) ئیمامی شافعی لە قەولی تازەی حەملی كردوتە سەر (نەدب) یەعنی سونەتە قەدەغە نەكا. كەوایە بۆ خاوەنی دارەكە نییە لەناو دیوار را بكا بێ ئیزنی خاوەنی دیوار. تۆبزیشی لێ ناكرێ بۆ دانانی دارەكە لەناو دیوارەكەی. مالكی یەكانو حەنەفیەكانیش حوكمیان پێ كردووە. لەبەر جەمع لە بەینی ئەم حەدیسەو حەدیسی خطبة الوداع كە فەرموویەتی «لايَحِلُّ لأمْرِئٍ مِنْ مَالِ أخِيهِ إلاَّ مَا أعْطَاهُ عَنْ طَيِّبِ نَفْسٍ» ((واتە حەلال نییە بۆ مرۆڤێك مالی برای خۆی الا مەگەر بەخۆشی خۆی دایبێتێ)) بەلام شافعی لەقەولی كۆنی حەملی كردۆتە سەر ایجاب یەعنی واجبە قەدەغە نەكا لە كاتی پێویست و مەرجی دیوارەكەش زەرەر نەبینی. ئەگەر خاوەن دیوار قەدەغەی كرد حاكم اجباری لێ دەكا بەم قەولە قەدیمە شافعی حوكمی كردووە ئەحمەدو اسحاق وە ئەصحابی حەدیث وابن حبیب لە مالكی یەكان چونكی هیچ فەرقو جیاوازی نییە لای ئەمانە لە بەینی ئەمە كە پێویستی بوونی خاوەنی دار بۆ دانانی دار لەناو كونی دار: یا محتاج نەبی چونكی سەری دارەكە دەرگەی كونی دیوارەكە پر دەكاتەوە دیوارەكە پێی مەحكەم تر دەبێ پاشان ئەبوو هورەیرە لەپاش ریوایەت

---

[٢] مدینی مماطل : واتە قەرزاری كە هەیبێ و قەرزەكە نەداتەوە.

کردنی ئەم حەدیسەی بۆ خاتری هاندانی خەڵك کە کار بکەن بەمەعنای دیاری ئەم حەدیسە واتە قەدەغە نەکریٚ دار دابنریٚ یا بکوتریٚ گوتیتی ((مَا لِي أَرَاكُمْ عَنْهَا مُعْرِضِينَ)) یەعنی بۆ چی عەمەل بەظاهری ئەم حەدیسە ناکەن ((وَاللَّه لأَرْمِيَنَّ بِهَا بَيْنَ أَكْتَافِكُمْ)) یەعنی والله ئەم مەقالەیەو عەمەل بەم حەدیسەدەبی لە بەینی شانتان بکوتم. یەعنی لەبەینی ئێوە بەدەنگی بەرز تەصریح دەکەم کەعەمەل بە ظاهری ئەم حەدیسە بکریٚو بەخەبەرتان بینم لە خەوی غەفلەت وەکوو بەخەبەر هێنانی دار کەلەناوشانی پیاوی خەوتوو بدریٚ. لە خەو هەڵدەستی. شەرقاوی دەڵیٚ احتمالی هەیە ضمیری بها دەگەرێتەوە بۆ لای خشبە: یەعنی ئەگەر بەم حوکمە رازی نەبن و کاری پیٚ نەکەن خەشەبە(دار) لەسەرملتان دادەنێم چی جایی لەسەر دیوار دابنێم چونکی پێغەمبەرﷺ تەوصییەی هەر بەچاکەو احسان بووە بەتایبەتی دەر حەق بە جیران زۆر اعتنای بەراگرتنی دڵی جیران کردووە.

٦٤٩- (( عن ابی سعید ﷺ ايَّاكُمْ والجلوسُ عَلى الطُرُقاتِ فاذا أبَيْتُمْ الا المَجالِسَ فاعْطوُا الطَّريقَ حَقَّها: قالوا وَمَا حَقُ الطَّريقِ قَالَ غَضُّ البَصَرِ وَكَفُّ الاذى ورَدُّ السَّلام وأمرٌ بالمَعْروفِ وَنهيٌ عنِ المُنْكَرِ)).

## تەرجەمە

دەگێرنەوە لە ئەبوو سەعیدی خودری ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی خۆتان بپاریزن لە دانشتنی سەر رێگاکان پی یان فەرموو ناتوانین دانەنیشین چونکی لەسەر ئەم رێگایانە چەند جێگای وامان هەیە لیٚ دادەنیشین قسان دەکەین فەرمووی ئنجا مادام هەردادەنیشن بدەنە رێگا حقوقەکانی. گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا حەقی رێگا چی‌یە. فەرمووی چاو قوچاندن لە حەرامە. واتا لە عەیبو عاری خەڵکی وە عەزاب

ئەدانی خەڵکیە. وە وەڵام دانەوەی سەلام لەو کەسەی سەلامت لێ دەکا وە فەرمان کردن بە چاکەو نەهی کردن لە خراپەیە.

(ش) لە سیاقی حەدیس رون دەبێتەوە نەهی لەبۆ تەنزیهە. نەکوو دانشتوو لەبەجێ گەیاندنی ئەم حەقانە بێتاقەت بن. وە دەشگەینی کە نەهێشتنی ئەسبابی خراپە لەپێش چاکەیە. چونکی پێشان نەهی کرد لە دانیشتنی سەر رێگا لەبەر نەهێشتنی خراپە. وە پاشان وەکوو پێیان فەرموو ناتوانین قسان نەکەین لەسەر رێیان روخصەتی فەرموو بەمەرجی دانی حەقی رێگا حەقەکانیشی بۆ روون کردنەوە.

٦٥٠- ((عن عبدالله بن عمر ﷺ مَنْ قُتِلَ دونَ مالِهِ فَهُوَ شَهِيد)).

**تەرجەمە**

دەگێڕنەوە لە عەبدالله ی کوڕی عومەر ﷺ پێغەمبەرﷺ هەرکەسێك کوژرا لەبەر موذافەعەو پاراستنی ماڵی خۆی ئەوکەسە رۆژی قیامەت دەخرێتە رێزی شەهیدان بەڵام لە دونیا ئەحکامی شەهیدانی لەسەر جێبەجێ ناکرێ بەم تەرزە ئەشوری و بەشمەکی خۆی بشرێتەوە.

# ((باب الشركة في الطعام))

## (( باسی هاوبەشی لە خواردەمەنی ))

٦٥١– العن أنس ﷺ كُلوُا وَحَبَسَ الرسولُ القِصَعَةَ المَكْسُورَةَ حَتىَّ فَرِغُوا فَدَفَعَ القِصَعَةَ الصَّحِيحَةَ)).

### تەرجەمە

دەگێڕنەوە لەئەنەس ﷺ گوتی پێغەمبەرﷺ لای حەزرەتی عائشەی خیزانی بوو. حەزرەتی صەفیەی خێزانیشی بە نۆکەری خۆی هەندێ خواردنی بۆ پێغەمبەر هەنارد(گوشتو کولێرە بوو) حەزرەتی عائشە دەستێکی لەزەرفی خواردنەکەی دا. وەزەرفەکەی شکاند. پێغەمبەرﷺ پارچەکانی زەرفەکەی پێکەوە ناوە. خواردەمەنی‌یە رژاوەکەی خستەوە ناو زەرفەکە. فەرمانی کردە ئەو ئەصحابانەی لە خدمەتی دا بوون فەرمووی بخۆن. نۆکەرەکەو زەرفە شکاوەکەی حەپس کرد هەتا لە خواردنەکەی بوونەوە. پاشان لەماڵی حەزرەتی عائیشە زەرفیکی ساغی‌بۆ صەفیە نارد. لە جیاتی زەرفە شکاوەکە. زەرفە شکاوەکەشی لەماڵی حەزرەتی عائیشە هێشتەوە.

(ش) لە متشابە الاجزاء حوکم بە مثل دەکرێ وەکو درهەمو سائری مثلیات. زەرفی خواردنیش لە متقومانە چلۆن حوکم بەبەخشینی مثل دەکرێ؟

(جەواب): بەیهەقی حیکایەتی کردووە هەردوو زەرفەکانی ماڵی پێغەمبەر بوون. ماڵی ئافرەتان نەبوون ئنجا بۆ موعاقەبەی ئەو ئافرەتەی زەرفەکەی شکاند زەرفە شکاوەکەی لای ئەو هێشتەوە. زەرفە ساغەکەشی بۆ خاوەنی زەرفە شکاوەکە ناردەوە. کەوایە ئەم حوکمەی پێغەمبەر(دەگێڕنەوە) لەسەر رێگەی حوکم نەبوو

بەسەر خەصم. لە ریوایەتێکی تر لە جیاتی صەفیە أم سەلەمە باس کراوە. بەلام ممکنە هەردوویان رووی دابێ بەلام لای زانایانی حەدیس ریوایەتی صەفیە پەسەند کراوە.

٦٥٢- ((عن سلمة ﷺ نادِ فی النّاسِ یَأْتُونَ بِفَضْلِ ازْوادِهِم إشهَدُوا انْ لا الە الا اللە وانّی رسولُ اللّە)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لەسەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ گوتی لەغەزای هەوازین زادو زەخیرەمان سووك بوو. ئەصحاب موحتاجی زەخیرە بوون. هاتنە لای پێغەمبەرﷺ ئیزنیان لێ خواست ووشترەکانیان بکوژنەوە بۆ خواردن ئیزنی دان حەزرەتی عومەر تووشیان هات. حیکایەتی یان بۆ کرد فەرمووی لە پاش ووشترەکانتان ئیوە چلۆن دەژین بە پیادەیی ئەم هەموو رۆیشتنە بکەن. بەهیلاك دەچن. چووە لای پێغەمبەرﷺ گوتی ئەی پێغەمبەری خودا ووشترەکانیان بچی بە پیادەیی هەموو بەهیلاك دەچن. پێغەمبەرﷺ فەرمووی بانگ بکە هەرچی زەخیرەیەکی ماویانە بینن بۆ لای من. کەوڵێك راخرا. ئەو زەخیرەی مابوو ئی هەموویان لەسەر رووکرا پێغەمبەرﷺ هەستا وە راوەستا لەسەر کەوڵەکە دوعای کردو داوای بەرەکەتی کرد بۆ زەخیرەکە پاشان فەرمووی هەر کەسێك زەرف و جۆرکی زەخیرەی خۆی بینی هەرکەس هات بەدوو دەستی خۆی چەنگێکی لێ داگرتو بردی هەتا هەموویان خەلاس بوون. پاشان پێغەمبەرﷺ هەستا فەرمووی (أشهد ان لا الە الا اللە وأشهد أني رسول اللە). بە ئیشارە وەبال موعجیزەیێکی کەتەئییدی ریسالەت دەکا.

(ش) ئەمە دەلیلە لەسەر جەوازی دابەشکردنی خواردن لە بەینی شریکان بە موجازەفەو تەخمین (بەگوترە) یەعنی بە بێ پێوان و کێشان.

٦٥٣- ((عن ابي موسى ﷺ انَّ الاشعَريينَ اذا ارمَلوا في الغَزْو أوْ قَلَّ طَعامُ عَيالِهِم بالمَدينَةِ جَمَعُوا ما كانَ عِنْدَهُم في ثَوْبٍ واحدٍ ثُمَّ اقْتَسَموا بَيْنَهُم في اناءٍ واحدٍ بالسَّويَّةِ فَهُمْ مِنّي وأنَا مِنْهُمْ)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبوو موسى عبد الله ى كوڕى قەيسى ئەشعەرى ﷺ گوتى فەرمووى پێغەمبەر ﷺ عەشیرەتی ئەشعەری لە ئەهلی یەمەن وەکوو لە غەزا زادو زەخیرەیان کۆتا ببێ یا خو لە مەدینە زادو زەخیرەی عائلەو منداڵەکانیان کەم ببێ کۆدەکەنەوە ئەو زەخیرەیەکی مابیتیان لەیەك جێگا لە جەواڵێك پاشان لەبەینی خۆیان دابەشی دەکەن بە عەیارێك وەکوو یەکتریان بەمساوات ئنجا ئەوان لەمنن منیش لەوانم یەعنی چونکی کردەوەیان وەکوو منە متصلن بەمن.

(ش): لەمەدا مەنقەبەیەکی گەورە هەیە بۆ ئەشعەریان. زاندرا لەم حەدیسە سونەتی تێکەڵ کردنی زادو زەخیرە لەسەفەرو لە هەر شوێنێکی تر. ئەم حەدیسە نابێتە دەلیل لە سەر دروست بوونی بەخشینی شتی نەزانراو. بەڵام بەخلاف بۆ هەندێ زانایان چونکی لازمە لە هبەو بەخشین ایجابو قبول هەبێ لەم دابەش کردنی زەخیرەش لێرە هیچ ایجاب وقبول نییە بەڵکی دلدانەوەو إباحە هەیە ئەمەش پێی ناگوترێ هبە.

٦٥٤- ((عن رافع ابن خديج ﷺ انَّ لهذه البَهائِمِ أوابِد كأوابِدِ الوَحْشِ فَمَا غَلَبَكُمْ مِنْها فاصْنَعوا بِهِ هكذا فَقُلْتُ إنّا نرجو العَدُوَّ غداً وَلَيْسَتْ مَعَنا مُدى أفَنَذْبَحُ بِالقَصَبِ فَقالَ ما انهَرَ الدَّمَ وَ ذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ فَكُلُوه لَيْسَ السِّنَّ والظُفُرَ وَسَأُحَدِّثُكُمْ عَن ذلِكَ امَّا السِّنُ فَعَظْمٌ وَأمَّا الظُفُر فَمَدىَ الحَبَشة)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە رافعی کوڕی خەدیج ﷺ گوتی لە خدمەت پێغەمبەر ﷺ لە غەزای حونەین وەکوو گەڕاینەوە لە ذو الحلیفە ئەصحابی موجاهدین زۆربرسی بوون مەڕو ووشترێکی زۆریشیان لە تالآنی کافران هێنا بوو. پێغەمبەریش خۆی لە دوایی لەشکر بوو. ئەصحابی کیرامیش بەعەجەلە هەندێ ووشترو مەڕیان لەتالآن کوشتەوە پێغەمبەر ﷺ وەکو هاتو فەرمووی ئەم مەنجەلآنە چین عەرزیان کرد لەشکر زۆر برسی بوون هەندێ مەڕو ووشترمان کوشتەوە بۆ خواردنی لەشکر. فەرمووی ئەم مەنجەلآنە سەریان شۆربکەنەوە ئاویان لێ بڕوا. گوشتەکەیان لەگەڵ جوملەی غنائم تەقسیم بکرێ یەك ووشترو دە مەڕ داندرا. ووشترێك رای کرد هەرچەندکردیان نەگیرا پاشان پیاوێك لە قەوم تیرێکی هاوێشتی خودا ووشترەکەی حەپس کرد پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی هەیە لەم ووشترانە چەند نەوافر حەیواناتی کێوی هەرچی کە دەرەقەتیان نەهاتن ئاوا تیریان باوینی وەکو حەیواناتی وەحشیە. رافع گەڕایەوە گوتی عەرزم کرد ئێمە وا دەبێ ئومێدی  موولاقاتی دوژمن دەکەین چەقۆ کێردمان لا نابی پێیان بکوژینەوە ئەگەر بەشیریش بکوژینەوە بۆ شەڕی کافران دەمی کول دەبی. ئەگەر بە قەمیش بکوژینەوە قەی چی دەکا فەرمووی بەهەرشتێك خوێن بەزۆری هەڵ بڕێژی ناوی خوداشی لەسەر بهێنرێ بیخۆن. ددان و نینۆك نەبێ یەعنی ئەگەر بەمانە بکوژرێتەوە حەرامە قسەی ئەمانەشتان بۆ دەکەم ئەما ددان ئێسقانە ئێسقانیش برایەکانمان لەقەومی جن دەی خۆن وەکوو حەیوانیش پێ بکوژرێتەوە پیس دەبێ. شتی پیسیش خواردنی حەرامە (نەوەوی) وئەما نینۆك کێردی قەومی حەبەشەیە دەست لە هەوکی حەیوان دەنێن بەنینۆکان حەیوان دەکوژنەوە یەعنی بەعەزابدانێکی زۆر حەیوانەکە دەخنکێنن حەبەشەش کافرن تەشەبوهیش بەکافران و شیعاری کافران حەرامە.

(ش)بۆیی لای ئەوەوی لە شافعیە لەظفر موطلەق مورادە چــی نینۆکــی ئـادەمی بێ چی حەیواناتی تریێ. متصل بێ یا منفصل پیس بێ یـا پـاك بـێ لـەم ئەحکامانـەدا ددانیش وەکوو نینۆکە. بـەڵام لای ئـەبوو حەنیفـە و یوسـف و محمـد گوتویانـە نینـۆك وددان ئەگەر منفصل بن واتە بەلەشەوە نەبن دروستە حەیوانیان پێ بگوژرێتەوە.

## ((مستنبطات))

## وەرگیراوەکان.

## واتە ئەو ئەحکامانەی لەم حەدیسە وەرگیراوە

یەکەم: وازاندرا لەم حەدیسە غەنیمەتی کافران وەکوو گەیشـتە دار الاسـلام بـێ دابەش کردن دروست نی‌یە خواردنی.

دووەم: وازاندرا دابەش کردنـی مـەڕومالاّتو ڕەشـەوولاّغ و ووشـتر دروسـتە بـێ تەقویمو قرساندن ئەمە لای مالكو ئەهلی کوفەو ئەبو ثە ور وایە ئەگـەر لیـك ڕازی بـن. بەڵام لای ئیمامی شافعی دروست نی‌یە. دابەش کردنی هیچ شـتێك لـە حـەیوانات بـەبێ قرساندن فەرموویتی نابینی لـێرەش هـەر دە مـەر بـوو بەقیمـەتی یـەك ووشـتر ئەمەیـە قرساندن وتقویم.

سێیەم: لازمە لە کوشتنەوە ڕۆینی خوێن یەعنی هەڵڕژاندنی خوین بەزۆری هەتا گوشتی حەیوان پاك بێتەوە لە خوێن کە پیسە ئەگـەر نەکوژرێتـەوە یـەعنی مـردار بـی گۆشتەکەی بەموجاوەرەی ئەم خوێنەی کە تەقەلوبی بووە بە ئاو پیسە.

چوارەم: هەر حەیوانەکی ماڵی کە بووە کێوی کوشتنەوەی وەکـو کوشـتنەوەی حەیوانی کێوی‌یە چونکی حەدیسی ابو العشرا پێغەمبەرﷺ فـەرموویتی(لَوْ طَعَنْتُ فِي

فَخُذِهَا لا جَزَآءَ عَنْكَ!!. ئەبو حنیفەو شافعی لەسەر قسەی حەزرەتی عەلی وابن مسعود وابن عباس و ابن عمر وایان حوکم کردووە. بەلام ئیمامی مالك گوتیتی لەم حەدیسە رۆن ناکاتەوە کەتیرەکە کوشتیتی بەلکی دەلیٚ خودا ووشترەکەی حەبس کرد. ئنجا لە پاش حەپسیش دەگەریٚ بەمەقدور وە گەرا بەمەقدوریش گۆشتەکەی ناخوریٚ هەتا لەملی را کوشتنەوەیەکی مەشروع نەکوژریتەوە. ئەم حوکمە عامە لەحەیوانی وەحشیو انسی.

واتە حەیوانی کێوی و مالّی لەمەعنای فاصنعوا بە هکذا امامی مالك گوتیتی ئێمە حوکم دەکەین بە گوێرەی ئەم قسەیە تیری باوینی وە حەپسی بکەین. پاشان ئەگەر بەزیندوو گەیشتینیٚ دەی کوژینەوە ئەگەر بەمردوش گەیشتینیٚ نای خۆین چونکی لە حەدیسدا تەعیینی یەکێکیانی نەکردووە کە وایە الحاق کراوە بە مجملات و نابێتە حوجەت وە دەرحەق حەدیسی ابو العشرا گوتویانە راست نی‌یە. ابو الحسینی میمونی گوتی لەم حەدیسە پرسیارم لە امامی احمد کرد گوتی ئەمە لای من وایە غەلەتە. گوتم چی دەلیٚ گوتی من پێم خۆش نی‌یە هیچ بلێم وە حوکمیشی پیٚ ناکەم لە جێگای پێویست نەبیٚ. چلۆنێك کە بۆت ممکن بوو بیکوژی‌یەوە. دەبی هەر لەملی‌یەوە بیکوژی‌یەوە لە ئەعضائێکی‌تر ناکوژرێتەوە.

پێنجەم: وازانرا لەم حەدیسە ناوهێنان یان تسمیە شەرتە لەکاتی کوشتنەوە (واتا بگوتریٚ بسم الله الرحمن الرحیم)چونکی حەدیس پێکەوەی باس کردن ئەوجا فەرموی (فکلوە) یەعنی ئەمریکی اباحی بەخواردن دا. مەعنا تەسمیەو کوشتنەوەی لەمل بێتەجی. ئنجا حەلالّە خواردنی. ئەمەبووە حوجەت لەسەر فەرموودەی ئیمامی شافعی لەوەی کە مەرج نی‌یە ناو هینان لە کاتی کوشتنەوە فەرموویتی ئەگەر کەسێك بسم الله نەکات بەعەمدی یاخۆ بەلەبیر چوون حەیوانە کوژراوەکە دەخوریٚ ئیمامی

مالیك گوتیتی ئەگەر لەبیر چوون بـێ خواردنـی حەڵاڵـە ئەگـەر بەعـەمدی بـێ حەرامـە. ئیمامی حەنەفیش لەسەر ئەم قسەیە.

شەشەم: وازاندرا لەم حەدیسە عەدەمی جەوازی کوشتنەوەبەددان‌و نینـۆك واتـا دروست نیـە بـە نینـۆك یـا بـە ددان حـەیوان بکوژریتـەوە. لای شـافعی‌و ابـو حنیفـەو یوسف‌و محمدیش ئەگەر متصل بن یا منفصل بن.

ریوایەتی دووەم وەکو مەزهەبی ئیمامی شافعی‌یە.

ریوایەتی سێیەم وەکوو مەزهەبی ئەبوو حەنیفەیە.

ریوایەتی چوارەم دروستە بەهەر کامێك لەددان‌و نینۆك.

٦٥٥- «عن ابي هريرة ﷺ منْ أعْتَقَ شَقيصاً مِنْ مَمْلُوكِهِ فَعَلَيْهِ خِلاصُهُ مِنْ مالِهِ فَانْ لَمْ يَكُنْ لهُ مالٌ قُوِّمَ المَمْلُوكُ قِيمَةَ عَدْلٍ ثُمَّ اُسْتُسْعِيَ غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ».

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبو هوریرە ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی هەر کەسێك ئـازاد بکـا لە عەبدی هاوبەش لە بەینی چەند کەسێك بەشی خۆی لەسەری پێویسـتە نـەجاتی بـدا لـە بەندایـەتی شـریکەکانی تریشـی لـە مـاڵی خـۆی. ئەگـەر ماڵیشـی نـەبوو عەبدەکـە بەقیمەتێکی ناوەنجی نرخەکەی دادەنرێ پاشان پێویست دەکرێ لە سەری بـەکارکردن و کۆششێکی وا لەتاقەتی خۆی‌دابێ هەتا خۆی رزگار دەکا لە بەندایـەتی شـەریکەکانی تریش.

(ش) بێژراوە قسەی سعایەتی عەبدەکە یەعنی لەفظی (أستسـعی) لـە حـەدیس قسەی پێغەمبەرﷺ نیـە بـەڵکی قسـەی قەتادەیـە. کـە ریوایـەتی کـردووە لـە ئـەبوو هوریرە لەگەڵ حەدیس تیکـەل کـراوە هـەروەکو نەسائی وای فـەرمووە. محمدو ئـەبو یوسـف و جمهوری علمـاو أئمـە غـەیری ئیمـامی ئـەعزەم. لەسـەر حوکـم بـەم تێکـەڵ

کردنەن. بەدەلیلی بەتالّ بونی استسعا واتە تێ کۆشان بەحەدیسی عمرانی کوڕی حەصین لای مسلم. بەم ریوایەتە کەلەزەمانی پێغەمبەرﷺ پیاوێك لەکاتی وەفات شەش عەبدی خۆی ئازاد کرد هیچ ماڵی تریشی نەبوو بێ لە عەبدەکان وارثەکانیش رازی نەبوون بەنائومێد بوونی خۆیان لەهەموو میراتی مردووەکە. زیاد لە سێ یەك نەدەبوو وەصیەت پێغەمبەرﷺ عەبدەکانی کردە سێ بەش بەکردنی قورعە دوو بەندە لەسەر هەر شەشیان ئازاد کران کە دەکا سێ یەکی ماڵی مردوو چواریشیان دانەوە میرات گرەکان. ئەگەر استسعا واتە تێ کۆشانو کارکردنی بەندەکان موعتەبەر بوایە دەبوایە هەر عەبدێك وەکو ۳/۱ ئازاد کرا بەوەصیەت ۳/۲ دوو سێ یەکەی تریشی بەحەوالە وەبال سەعیو ئیش کردن خۆی ئازاد بکا وە دەبوایە فەرمانیان پێ بکا بۆ دوو سێ یەکەکەیتر ئیشو کار بکەن خۆیان لە میرات گرەکان بکڕنەوە مادام پێغەمبەرﷺ وای نەکرد بەڵکی دوو عەبدی کردە وەصیەتو ئازاد کران. چواریشی کردە ماڵی میرات گرەکان. دیاربوو لەفظی (استسعی) حەدیس نیە. بەلام ئیمامی ئەعزەم گوتیتی هەر کەسێك لە عەبدیك بەشی خۆی ئازاد کرد ئەگەر پیاوە ئازاد کەرەکە ماڵی نەبوویەشەکانی تریشی بکرێتەوە. عەبدەکە حەوالە بەسەعی خۆی دەکرێ خۆی بکریتەوە یەعنی لەفظی(استسعی) حەدیسە حوکمی بەمەعنای دیاری ئەم حەدیسە کردووە(یەعنی حوکمی بە ظاهری ئەم حەدیسە کردووە).

٦٥٦- ((عن النّعمانِ بن بشيرٍ ﷺ قالَ ﷺ مَثَلُ القَائِمِ على حدودِ اللهِ والواقِعِ فيها كَمَثَلِ قَوْمٍ اسْتَهَموا على سَفينةٍ فَأصابَ بَعْضَهُمْ أعلاها وَبَعضَهُم اسْفَلَها فكَانَ الَّذينَ في اسْفَلِها اذا استَقَوا مِنَ الماءِ مَرّوا على مَنْ فَوْقَهُمْ فَقَالوا لَوْ أنّا خَرَقْنا في نَصيبِنا خَرْقاً وَلَمْ نُؤْذِ مَنْ فَوْقَنا فأن تَرَكُوهُم وَما أرادوا هَلَكوا جَميعاً وانْ أَخَذُوا عَلى أيْدِيهِم نَجَوا ونَجَوا جَميعا)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لەنەعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەگێڕنەوە مثالو وێنەی ئەوان کەسانی بە چەسپاوی راوەستاون لەسەر بەجێ گەیاندنی فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە. وە ئەوان کەسانی کە سنوورەکانی شەرع بەجێ دێڵن وە فەرمان بەچاکە ناکەن و نەهی لە خراپە ناکەن وەکوو قەومێکی کەشتییەکییان کریبێ یاخۆ بەکرێیان گرتبێ پاشان لە بەینی خۆشیان پێك نێن لەسەر طەبەقەی خوارەوە و سەرەوەی کەشتییەکە. ئنجا قورعە باوێن. پاشان طەبەقەی سەرەوە کە خۆشە بەهەندێکی یان بیرێ. ئنجا ئەولنەی لە طەبەقەی خوارەوەن وەکو داوای ئەو بکەن ئەبێ بەلای ئەوانەی طەبەقەی سەرەوەدا رەت ببن. ئەگەر نا ناگەنە ئاو چونکی جێگایان عەنباری بنەوەیە لەناو بەحرا. ئنجا بۆ ئەوەی ئاویان بگاتێ بە ئاسانی بڵێن ئەگەر ئێمە کونێك لەم پاپۆرە بکەین لە طەبەقەی بنەوە کە بەقورعە بوویتە ملکی خۆمانو ئەهلی طەبەقەی سەرەوەش ئەزیەت نەدەین بەسەبەب رەت بوونمان بەسەر ئەواندا نەوەك پێیان ناخۆش بێ ئنجا خەریك بن بەبیورو تەوشوو کونی بکەن پاشان ئەوانەی کە لە طەبەقەی سەرەوەشن ئەگەر واز بێنن لەوان لە کون کردنەکەیان بەم تەرزە رێگای باشییان نیشان بدەن وە ئامۆژگاریان بکەن ئەوانەی کە لە پاپۆرەکەدان بە عمومی ئەوانەی کە لە سەرەوەشن نەجاتییان دەبێ ئەهلی خوارەوەش نەجاتی دەبێ. یەعنی اقامەی حدود کە لە پاش ئەرکانی ئیسلام فەرمان بەچاکەو نەهی لە خراپەیە سەبەبی نەجاتە بۆ طەبەقەی خوارەوەش کە گوناە کارەکانن بەسەبەب گەڕانەوەیان لە گوناهان لە طەبەقەی سەرەوەش کەئیماندارو زانایەکانن بە ئامۆژگاری کردن و ارشادیان.

((قسەی مترجم))

فەهم کرا لەم حەدیسە پیرۆزە ئەم دونیایە دەریایە ئەم شەریعەتی ئیسلامییە کەشتییە ئەهلی طەبەقەی سەرەوە پیاو چاکەکانن ئەهلی طەبەقەی خوارەوەش پیاو

خراپەکانن. هەروەقتێك ئەهلی ئیرشاد ئەما دونیاش تێك دەچی إمامی شافعیش موافقی ئەم تەشبیهە. چەند شیعرێکی هەیە کە ئەفەرموێ:

إنَّ للهِ عِبَاداً فَطِنَـــــا طَلَّقوا الدُّنْيَا وَخَافُوا إلْفَتَنَا
نَظَرُوا فيهَا فَلَمَّا عَلِمُوا إنَّهَا لَيْسَتْ لِحَيٍّ وَطَنَـــــا
جَعَلُوهَا لُجَّةً وَاتَّخَذُوا صَالِحَ الأَعْمَالِ فِيهَا سُفُنَـــا

لەم حەدیسە زاندرا بەجەوازی تەقسیمی عـاردو ئەشـیای جـۆر بـەجۆر بەقورعە لای جمهوری عولەما غەیری کوفی گوتویانە لەگەڵ (ئەزلام) پێك دەچن کـە عـادەتێکی جاهلی بوو دروست نییە. بەکوردی ئەزلام ئەوەیـە ئەگـەر بچوباتایـە جێگایـەك تیریـان رادەکێشـا ئەگـەر جـوت بـا ژمـارەی تیرەکـان دەچوونـە سـەفەرەکە ئەگـەر تـاق بایـە نەدەچوون.

٦٥٧- «عن عبد الله بن هشام ﷺ قال صلى الله تعالى عليه وسلم هُوَ صَغِيرٌ حِينَ ذَهَبَتْ بِهِ أُمُّهُ زَيْنَبُ فَقَالَتْ يارسولَ اللهِ بايِعْهُ فَقَالَه ثُمَّ مَسَحَ رأسَهُ وَدَعا لَه».

## تەرجەمە

دەگێڕنـەوە لـە عبـدالله ی کـوڕی هشـام بەشـەش سـاڵ لـە پێـش وەفـاتی پێغەمبەرﷺ بە خزمـەتی گەیشت. دایکی کـە زەینـەبی کچـی حـەمید بـوو بردیـە لای پێغەمبەرﷺ گوتـی ئـەی پێغەمبـەری خـودا (بایعـە) یـەعنی لەسـەر موسـوڵمان بوونـە موبایەعەو موقاعەدەی لەگەڵ بکە. پێغەمبەرﷺ فەرمووی ئەمە منداڵە دەستی پیرۆزی بەسەری داهێناو دوعای بەرەکـەتی بـۆ کـرد. ئنجـا عبـدالله ی کـوڕی هشـام بـۆ کڕینـی خواردن دەچووە بازار. عبدالله ی کوڕی عومەر وعبدالله ی کوڕی زوبیر تووشی دەهـاتن پێیان دەگوت بمانکە شریکی خۆت چونکی پێغەمبەرﷺ دوعای بەرەکەتی بۆ کـردووە

ئەویش دەی کردنە شریك زۆر جار وا رووی دەدا لە قازانج بارە ووشترێکی تەواوی دەناردەوە ماڵێ.

ئەم حەدیسە پیرۆزە دەلیلە لەسەر ئەوەی کە دروستە لە خواردەمەنی شریکایەتی‌و هاوبەش بوون. لای جمهور شریکایەتی تایبەت‌و مختصە بە مثلی یەعنی ماڵی هەردوو شریکان یەك جنس بێ. بەم تەرزە ماڵی هەردویان گەنم بێ. یاخو جۆ بێ نەك ماڵی یەکێك جۆ بێ ئەویتر گەنم بێ چونکی توشی ریبا دەبێ. بەڵام ئەگەر کەسێك بیەوێ شریکایەتی بکا لەغەیری جنس لە ماڵەکی کە نرخی بۆ داندرابێ. وەکو شەکر یان گەنم یا خۆ جۆ. مثلا هەر یەك لە شەریکەکان هەندێك لە ماڵی خۆی بەقەرز بفرۆشێتە ئەویتر یان بۆ استقراری ملك لەیەکتریشیان قەبض بکەن. لە ریبا نەجاتیان دەبێ (لەکتابی رەوضەوا دەڵێ) دوو شریکە کانیش یەکتر یان ئیزن بدەن لەتەصەروف ئنجا لە جنس چی متفق بن چی مختلف بن لای مالکی‌یەکانیش مەکروهە شریکایەتی لە خواردەمەنی بەڵام قسەی راجحیشیان جەوازە واتە دروستە.

# ((كتاب الرهن))

# باسی رەهن

٦٥٨- ((عن ابي هريرة ﷺ الظَهْرُ يُرْكَبُ بِنَفَقَتِهِ اذا كانَ مَرْهُوناً وَلَبَنُ الدر يُشْرَبُ بِنَفَقَتِهِ اذا كانَ مَرْهُوناً وَعَلى الَذي يَرْكَبُ وَيَشرَبُ النَفَقَةُ)).

**تەرجەمە**

دەگێڕنەوە لە ئەبوو هوریرە ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی پشتی وولاغی سواری کە رەهن کراو بێ سـوار بوونـیو تەفەقـەی وولاغەکە لـە ئـالیکو ئـاو دانـی و ئـەنواعی خدمەتی غەیری تەداوی لەسەر مورتەهنە(یەعنی ئەو کەسـەی کـە قبـوولی رەهـن دەکا شیری حەیوانی بەشیریش دەخورێتەوە بەنەفەقەی خۆی وەکوو رەهن کراو بـێ یـەعنی لە پاش رەهن شیرو نەفەقەی ئـەوەی رەهـن کـراوە دەگەڕێتـەوە بـۆ لای ئـەو کەسـەی رەهنی کردووە(موڕتەهن).

هەروەکو پێش رەهن دەگەراوە بۆ لای ئەو کەسەی بەرەهنی داوە (راهن).

چونکی خاوەن بوو ئەمە لای سێ مەزهەب غەیری شافعی. وەلەسەر ئەوکەسەی کە شیرەکەی دەخواتەوەو سواری وولاغەکە دەبێ کە راهنە لای شافعی موڕتەهنـە لای حەنەفی واجبەنەفەقە لە ئـەنواعی تـەکالیفی (مرهـون)لـە غـەیری ئـەم دوو حەیوانـەش وەکو نەفەقەی عەبدی رەهن کراو وەکـوو ئـاودانی بـاغو باغچـەی رەهـن کـراو. وەکوو کرێی ئەم خانوەی کە ماڵی رەهن کراوی تیایە. ئەگەر ئەوی رەهنی کـردووە تەبـەڕوع نەکا بۆی هەیە اجبار لەو کەسە بکا کە بـە رەهنـی داوە لەسـەر ئەمانـەی لای شـافعی. بەڵام کرێی تەداوی و چارە کردنی نەخۆشی ئەو شتەی رەهن کراوە عـائد بـەو کەسە

نی‌یه كه به‌ره‌هنی گرتووه. (ئه‌م ئه‌حكامانه‌ی تایبه‌ت به‌وه‌ی كه ره‌هن كراوه ده‌بایه له پاش مه‌عنای شافعی بنووسری)). ((به‌لام مه‌عنای حه‌دیس لای ئیمامی شافعی)) فه‌رموویتی مه‌عنای حه‌دیس سواربوونی حه‌یوانی ره‌هن كراو، وه‌كوو زه‌مانی پێش ره‌هنه چونكی مالكی ره‌قه‌به‌یتی ئه‌گه‌ر بش به‌خشی له‌به‌رامبه‌ر مه‌نافع و كه‌ڵك وه‌رگرتن نی‌یه بۆیێ موشابه‌هه‌ی نابێ به‌ریبا. به‌لام ئه‌گه‌ر مه‌نافع بۆ ئه‌و كه‌سه بێ ره‌هنی كردووه له‌به‌رامبه‌ر انفاق و پاره‌سه‌رف كردن. یه‌عنی هه‌ردوویان عائد به‌و بن وه‌كوو سێ مه‌زهه‌به‌كانی تر گوتویانه موشابه‌هه‌ی به‌ریبا هه‌یه. گۆیا مه‌نافیعه‌كه‌و كه‌ڵك وه‌رگرتنه‌كه‌ی ئه‌بێته فائزی قه‌رده‌كه‌ی. به‌لام ئه‌و كه‌سه‌ی ملكه‌كه‌ی به‌ره‌هن داوه واته (راهن) نه‌فه‌قه نه‌كا بالفرض له سه‌ریان. ئه‌و كه‌سه‌ی ملكه‌كه‌ی به‌ره‌هن گرتووه نه‌فه‌قه ده‌كاو پاره له‌م ملكه سه‌رف ده‌كا به‌رامبه‌ر كه‌ڵك وه‌رگرتن لێی نه‌ك له‌و قه‌رزه‌ی كه له‌سه‌ر ئه‌و كه‌سه‌ی هه‌یه كه ملكه‌كه‌ی لێ به‌ره‌هن گرتووه. واتا قه‌رزه‌كه‌ی هه‌رماوه له‌سه‌ر ئه‌و كه‌سه‌ی ملكه‌كه‌ی لێ به‌ره‌هن گرتووه.

ده‌لیلی ئه‌و سێ مه‌زهه‌بانه‌ش ده‌ڵێن ئه‌گه‌ر نه‌فه‌قه‌و واته سه‌رف كردن له‌سه‌ر ملكه‌كه‌و كه‌ڵك وه‌رگرتنیش له‌م ملكه هه‌ر بۆ راهن بی واته ئه‌و كه‌سه‌ی ملكه‌كه‌ی به‌ره‌هن داوه منافاة لازم دێ له‌گه‌ڵ حوكمی ره‌هن كه حه‌بسی دائمه چونكی وه‌كوو ووتمان وابی حه‌بس نامینی. وه‌لازمیش دێ به‌هیچ جۆریك ئه‌و كه‌سه‌ی ملكه‌كه‌ی به‌ره‌هن گرتووه (مرتهن) نابێ كه‌ڵك وه‌ربگرێ له‌م ملكه. یان ئه‌و شته‌ی ره‌هن كراوه (مرهون) به‌م ته‌رزه ئه‌گه‌ر عه‌بدی خدمه‌ت پێ نه‌كا یان ئه‌گه‌ر خانوو بێ تیای‌دا نه‌نیشێ ئه‌گه‌ر قورئان بێ تیای‌دا نه‌خوێنێ وه بۆشی نی‌یه بیفرۆشی به‌ئیزنی (راهن) نه‌بێ. ئه‌مه‌ش له كتێبی عه‌ینی جلدی٦ص١٩٧باس ده‌كا.

نووسه‌ری ئه‌م دێرانه‌ش كه موته‌رجیمه ده‌ڵێ:

له(على الذين يركب ويشرب النفقة) فەهەم دەكریٚو دەزاندریٚ كە راهن‌و مورتەهن هەر كامیان نەفەقە بكەن واتە پارە سەرف بكەن بەسەر ئەو شتەی رەهن كراوە كەڵك وەرگرتن لە (مرهون) واتە ئەو شتەی رەهن كراوە بۆ ئەو ئەبیٚ. بۆیێ بیری جیاواز لەناو ئیمامەكان پەیدا بووە رەحمەتی خوایان لیٚ بیٚ. چونكی عبارەتی بلیغەی پیٚغەمبەرﷺ تەحەمولی راهن و مورتەهن دەكا.

# كتاب العتق

## باسی ئازاد كردنی بەندە

٦٥٩- ((عن ابي هريرة ﷺ أيُّما رَجُلٍ أعْتَقَ إمْرِءاً مُسْلِماً اسْتَنْقَذَ اللّهُ بِكُلِّ عُضْوِ مِنْهُ فى النَّار)).

### تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبو هوریرە ﷺ پیٚغەمبەرﷺ فەرمووی هەرپیاوێكی موسوڵمان ئازاد بكا بەندەیەكی موسوڵمان خودا قورتار دەكا بەهەر ئەندامێك لەلەشی بەندەكە لەئەندامێك لەلەشی موسوڵمانەكەی ئازادكەر لە ئاگر.

(ش) خطابی بە گێڕانەوە لە هەندیٚ زانایان گوتیتی وا باشە بەندەكە هیچ ئەندامەكی كەمی نەبیٚ بۆ خاتری ئەندامەكانی لەشی بەندەكەی ئازادكراوو ئەو كەسەی بەندەكە ئازاد دەكا هەموو ئەندامەكان بەبەر یەكتری بكەون وەمەرجیشە دەبیٚ ئەو عەبدەی ئازاد دەكریٚ موسوڵمان بیٚ.

٦٦٠- ((عن ابي ذَر إيمانٌ باللّهِ وَجِهادٌ فى سَبِيلِهِ قُلْتُ فايُّ الرِّقابِ افْضَلُ قَالَ اغْلاها ثَمَناً وانْفَسُها عِنْدَ اهْلِها قُلْتُ فان لمْ افْعَل قَالَ تُعينُ صانِعاً او تَصْنَعَ لأخْرَقَ قُلْتُ فانْ لَمْ افعَلْ قَالَ تَدَعُ النَّاسَ مِنَ الشَّرِ فانها صَدَقَةٌ تَصَّدَقُ بِها على نَفْسِكَ)).

### تەرجەمە

دەگێرنەوە لە ئەبو ذەر (ناوی جوندوب بو کوڕی جەنادەی غـەفاری)ﷺ گوتـی پرسیم لە پێغەمبەرﷺ کامە کردەوەیەك گەورەترە. فەرمووی ئیمان بەخوداو کوشتارو جهاد لەگەڵ کافران لـە ڕێگای خـودا. گـوتم کامـە عـەبدێك و بەندەیـەك گـەورەترە بـۆ ئازادکردن. فـەرمووی گرانـترین بـەندەکان بـە قیمـەتو خۆشەویسـت ترینیـان لای گەورەکانیان پێم فـەرموو ئـەی ئەگـەر پێم نـەکرا اقتـدارم نـەبوو بـەندە ئـازاد بکـەم فەرمووی بەنەفسی خۆت یا بەماڵی خۆت یـاریدەو اغاثـەی ئیشـکەرێك بـدە. یـاخو بـۆ بێچارەیەکی عاجز لە ئیش ئیـش بکـە. گـوتم ئـەدی ئەگـەر پێم نـەکرا یارمـەتی خـەڵك بدەمو ئیش بۆ ئەو کەسە بکەم کە بێچارە بێ. فـەرمووی خـەڵك بپـارێزە لـە خراپـەی خۆت ئەمەش صەدەقەیەکەبۆ خۆت دەیکەی.

٦٦١- ((عن عبدالله بن عمر ﷺ قال ﷺ مَنْ اعْتَقَ شِرْكاً لَهُ فی عَبْدٍ فَكَانَ لَهُ مالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَ العَبْدِ قُوِّمَ العَبْدُ عَلَيْهِ قِيمَةَ عَدْلٍ فاعْطى شُركائَهُ حصصهم وعَتَقَ عليه العَبْد والا فَقَدْ عتق منه ما عَتَقَ)).

## تەرجەمە

دەگێرنەوە لـەعبد الله ی کـوڕی عمـر ﷺ پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی هەرکەسـێك لەبەندەی (موشتەرەك)بـەشو حصـەی خـۆی ئـازاد بکـا وەبەقـەدەر تـەواوی قیمـەتی بەندەکەیش ماڵ و سامانی هەبێ بەتەخمین دیار دەکرێ قیمەتی بەندەکە بە مقدارێکی موعتەدیل بێ افراط و تەفریط لەسەر ئـەو. پاشـان شـریکەکانیش هـەر کەسـە حصـەی خـۆی پـێ دەدا وەبەندەکـەش لەسـەر ئـەو ئـازاد دەبـێ حصەیـەك بـە ئـازادکردنی حصەکانی تریش بەسرایەت وەئەگەر بەقەدەر تەواوی قیمەتی عەبدەکەماڵی نەبوو . بە تەحقیق ئازاد دەبێ لە عەبدەکە هەر ئەو میقداری کە ئازاد بوو.

ئەحکامی ئەم حەدیسە چوار حەدیس لە پێش ئەمە لە حەدیسیی ئـەبو هوریـرە ژمارە٦٥٥رەت بوو لەپاش شریکایەتی.

٦٦٢- ((عن ابي هريرة ﷺ انَّ اللّهَ تَجاوَزَ لی عَنْ امَتی ماوَسْوَسَتْ بِهِ صُدُورهم مالَمْ تَعْمَلْ أو تَكَلَّمْ)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبو هـەریرە ﷺ پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی بەتـەحقیق وە بـەبێ گومان خودای گەورە لەبەرمن لەئومەتی من خۆشبوو لە هەر گونـاهێکی بـەدەروونیاند تێ بپەڕی مادام نەهاتبێتە پەیدابوون بەم تەرزە ئەگەر گوناهەکە بەکردەوەبێ (فیعلی بێ) چاووگوی و هەستەکان نەیان کردبێ یان بەقسە بێ قسەی پێ نەکردبێ.

(ش) هەلەو لەبیر چونیش اعتباری پێ ی نی یە لای شافعی یەکان لە عقد وطلاق و ئەوانەی کە مرۆڤ بی یەوێ بیڵێ. پاشان زمانی سەبقەت بکا شـتێکی تـر بڵـێ مەئەلەی لەکاتی گفتو گۆدا یەکێك بە ژنی خۆی بڵێ (طلقـتك) پاشـان بڵـێ زمـانم سـەبقەتی کرد مەبەستم نەبو ئەوە بڵێم بەڵکو دەمویست بڵێم (طلبتك) واتا داوام کردی ئەمـە طـەلاقی ناکەوی بەلام بەبێ هەبوونی قەرینەیەك کە دەلالـەت لەسـەر مەبەسـتی بکا ظـاهرا لێی قبول ناکرێ بەلام ئەگەر ژنەکە بە عەلامەتێك ظە نـی وابـوو راسـت دەکـا لازمـە قبـووڵ قسـەی بکـاو موخاصەمـەو مشـتومڕی لەگـەڵ نـەکا (مـاوردی)وای گوتووە(رویانیش)گوتویەتی قسەی هەڵبژادە ئەمەیـە. ئـەما ئـازادکردنی عـەبدو طـەلاق دان بەگاڵتـە ظاهراوباطنـا واتـە بـە ئاشـکراو نـا ئاشـکرا دەکـەوی. ابـن العربـی لـە مالکی یەکان گوتیتی مەبەسـت لـە (مـالم تکلـم) کـەلامی نەفسـی مەبەسـتە چونکـی لـە راستیدا قسە عبارەتە لەو قسانەی کە لەناو دڵدایە. زمان تەرجەمانی دلە. ئـەم قسـەیە لەکەس بزر نی یە. نابینی (اخطل) کە شاعیریکی دیان بووە گوتیتـی(إنَّ الكَلَامَ لَفِي الفُؤَادِ وَإنَّمَا جُعِلَ اللِّسَانَ عَلَى الكَلَامِ دَلِيلاً).

کەوایە طەلاق یان بەندە ئازادکردن بەنیەتیش دەکەوی با بەقسەش نەڵێ. بەلام شافعی یەکان رەدی ئەم قسەیان کردووتەوە گوتویانە ئەگەر بەخەیالاتی کە بـەناو دڵد

تیٚدەپەری خەڵك حسابیان لەگەڵ بکریٚ ئەبوایا هەموو نویٚژیك قەضای واجب بی. چونکی نویٚژی بیٚ خیالات لە عالەمی ئەم زەمانەنیيە. هەتا ئیمامی عومەر ﷺ فەرموویتی (انی لأجهز جیشی وانا في الصلاة) یەعنیمن لەنویٚژدا لەخەیاڵی ریٚك خستنی لەشکرم بۆ جهادکە وایە قسەی ناو دڵ بەقەطعی اعتباری نیيە. ئەگەر بگوتریٚ چۆن حەدیس فەرموویتی(مالم تکلم)عەفووە. خۆ گوتویانە هەرکەسیٚك بەدڵ بیەویٚ گوناهیٚك بکا حسابی لەگەڵ دەکریٚ دەڵیٚن لە خەتەرات و خەیاڵەکانی دڵ دووبەشی هەیە.

یەکیيان: عەزمیيە بەم تەرزە لەناو دڵی چەسپاوە وەکو کەسیٚك دائم فکر بکا هەرکاتیٚك بۆی ریٚك بکەویٚ کفرەکەی بەدیار بخا بیٚ شك ئەو کەسە لەو کاتەوە کە ئەم خەیاڵەی لەناو دڵدایە حسابی لەگەڵ کراوە کافرە.

دووەم: عەزمی نیيە بەم تەرزە دڵی خۆی نەچەسپاندووە لەسەر ئەم خەیاڵە بەڵکی هەر فکریٚکە بەدڵیدا تیٚدەپەریٚ بیٚ شك لەمەدا حساب لەگەڵ کردن نیيە ئەگەر چی بە موطلەقیش باس کراوە هەتا یەك بگریٚتەوە لەگەڵ ئایەتی ﴿انَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ انْ تَشِيعَ الفاحِشَةُ﴾ لەگەڵ ئەمەش وەسوەسە استعمال ناکریٚ لە کاتی دوودلی نەبیٚ ئەنجامی ئەم قسانە ئەمەیە ئەگەر بەخەیاڵ کردنی ناو دڵ لیٚ پرسینەوە هەبوایە دەرحەق بە یوسف پیٚغەمبەر کە پاکە لە گوناە لە قورئان نەی دەفەرموو﴿وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ وَهَمَّ بِهَا﴾ دیارە بەهەمی قەلبی یەعنی مەبەستی ناو دڵ لیٚ پرسینەوە نیيە.

هەندیٚ لەزاناکان استدلالیان کردووە (مالم تعمل) ئەگەر کەسیٚك بەنووسین ژنی خۆی طلاق بدا طلاقی دەکەویٚ چونکی نووسینیش کاریٚکە ئەمە قسەی محمدی کوڕی حسنو احمەدی کوڕی حەنبەلە امامی مالك اشهاد بە نووسین گیراوە بەمەرجی کەوتنی طلاق امامی شافعیش گوتیتی کنایەتە. بەم تەرزە ئەگەر مەبەستی لە نووسینەکە طەلاق دان بیٚ دەکەویٚ ئەگەرنا ناکەویٚ.

٦٦٣- «عن ابي هريرة ﷺ يا ابا هُرَيْرَة هذا غُلامُكَ قَدْ اتاكَ فَقَالَ امَا إنّي أُشْهِدُكَ أَنَّهُ حُر».

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبو هوریرە ﷺ وەکوو لە ساڵی فەتحی خەیبەروحەوتەمی هیجری لەمانگی موحەرەم بەنیەتی موسوڵمان بوون لەبەینی حودەیبەو خەیبەر هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ بەبەندەوە پاشان لەرێگا لەگەڵ بەندەکەی لەیەکتر بزر بوون هەر یەك رێگایەگی گرتبوو ئەبوو هورەیرە رۆژێـك لـە پێـش بەندەکـەی بـە خزمـەت پێغەمبەرﷺ گەیشت. بۆ سبەینە لە خزمەت پێغەمبەرﷺ دانشتبوو باسی ئازارو عەزابی شەوی هاتنی خۆی دەکرد بەم شیعرە دەی گوت:

یا لَيْلَةً مِنْ طُولِها وَعَنائِها        على انَّها مِنْ دارَةِ الكُفْرِ نَجَّت

یەعنی ئەی شەوە وای درێژو بە بەڵاو مەشەقەت بووی بەڵام لەوڵاتی کفر نەجاتت دام ئەم شیعرە ئەگەر چی لە بەحری طویلە بەڵام حەذفی تیا هەیە یەعنی حەذفی جزئێکی لەسەرەوەی ئەصلی (فیا لیلة) بووە.

پێغەمبەرﷺ فەرمووی ئەی ئەبا هورەیرە ئەمە بەندەکەتە ئەبو هوریرە گوتی بەڕاستی وە بەبێ گومان من تۆم کردە شاهید ئەم عەبدە حور بێ.

(ش) ئەم لەفظە بۆ ئازاد کردنی بەندە لە ئەلفاظی صەریحەو ئاشکرایە بەڵام ئەگەر یەکێك بە بەندەی خۆی بڵێ هیچ رێگام بەسەرتەوە نییە. یان هیچ حەقم بەسەرتەوە نییە کنایەتە دەیەوێ بۆ ئازاد بوونی عەبدەکە نییەتی ئازاد کردنی عەبدەکە و لەگەڵ لەفظی کنائی بەیەکەوە بن.

٦٦٤- «عن ابي هريرة ﷺ هُمْ اشَدُّ امَّتي على الدَّجال هذه صَدَقَات قومنا اعْتِقيها فانّها مِنْ وَلَدِ اسماعيلَ قالَهَا فی بَنی تَمِيم».

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە ﷺ گوتی لەو وەقتەوە دەرحەق بە قەبیلەی بەنی تەمیم سێ قسەم بیستووە لە پێغەمبەرﷺ بەنی تەمیمم خوش دەوێن:

یەکییان: فەرمووی بەنی تەمیم توندو بەهێزترینی خەڵکن لەسەرِ دەجال.

دووەم: وەکو زەکاتو خێراتیان بۆ مەدینە هات فەرمووی ئەمە زەکاتو خێراتی قەومەکانن.

سێیەم:جاریەکی ئەسیر کراو لە قەومی بەنی تەمیم لای حەزرەتی عائشە بوو پێغەمبەرﷺ ئەمری پێی کرد ئازادی بکە ئەم جاریە لە ئەولادی اسماعیل پێغەمبەرە سەلامی خوای لا بێ چونکی حەزرەتی عائشە لە پێشتر لەسەر خۆی نەزر کردبوو بەندەیەك ئازاد بکا لە ئەولادی اسماعیل بێ. چونکی تەمیم کوڕی حوڕە کوڕی ئەدی کوڕی طانجە کوڕی الیاس کوڕی موضەر بوو لە الیاس رەچەلەکییان یەك دەگرێتەوە لەگەڵ رەچەلەکی پیروزی پێغەمبەرﷺ.

(ش) ئەمە دەلیلە لەسەر ئەوەی کە دروستە عەرەبیش ببنە بەندە وەکوو سائری فیرەقی عەجەم بەڵام ئازاد کردنیان ئەفضەلەو باشترە.

٦٦٥- ((عن ابی هریرة ﷺ لایَقُلْ أحَدُکُمْ أطْعِمْ رَبَّکَ وَضیء رَبَّکَ اسْقِ رَبِّکَ وَلْیَقُلْ سَیِّدی وَمَولی وَلایَقُلْ أحَدُکُمْ عَبْدی وأمَتی وَلْیَقُل فَتایَ وَفتَاتی وَغُلامی)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی بایەکێکتان نەڵێ بەبەندەی خۆی خواردن بە بەخێوکەری خۆت بدە. دەست نوێژ بە پەروەردەکەری خۆت بدە یان ئاو بە بەخێو کەری خوت بدە چونکە رب بەمانا بە خێوکەر لە راستیدا ناوێکی تایبەتی خودایە. انسانیش کە مەربووبە متعبِّدە واتە خوادەپەرستی بە اخلاص

تەوحید بۆ خوداو تەرکی اشراکیش لەگەڵ ئەو(واتە خودا بەیەك دەزانی و کەسیش ناکاتە هاوبەشی)

(ش) نەهی لەم حەدیسە بۆ ئەدەبو تەنزیهە بۆ تەحریم نی‌یە چونکی لە قورئان هەیە ﴿اذکرني عند ربك﴾ و ﴿ارجع الى ربك﴾ یاخو بۆ زۆر بەکارهاتن و گێرانی ئەم لفظەیە (ووشەیە) بەعادەت نەك باعەبدیش بە خاوەنی خۆی بڵێ گەورەی من مەولای من چونکی مەولا بە شازدە مەعنا هاتووە بەمەعنا ناصر هاتووە (واتە یارمەتیدەر) وە بەمەعنا دۆست هاتووە وەکو حەدیسی «من کنت مولاه فعلي مولاه» وە هەمووی هەڵدەگری وە بە مەعنا خاوەن (مالك یان صاحب) هاتووە وەکو ﴿والله مولاکم﴾ هەروەکوو ئەوەوی وای فەرمووە ووشەی (سید) یش ئەگەر چی لە حەدیس هاتووە(السید الله)بەلام لەبەر باو بوون وبەکار هاتن وەکو لفظی رب لەخودای گەورە بەکار نایێ.

بانەیشڵێ یەکێکتان بە خطاب لەگەڵ بەندە یان جاریەی خۆی عەبدی خۆم یان جاریەی خۆم باعەبدو جاریەشی بێ بابەبەندە بڵێ لاوی خۆم بەژنی کارەکەریش بڵێ کارەکەری عازەبی خۆم. باسید بەبەندەو جاریەی خۆیشی نەڵێ کوڕی خۆم یان کچی خۆم چونکی لای ئیمامی ئەعزەم ئەگەر کەسێك بەبەندەی خۆی بڵێ ئەمە کوڕی منە یان بە جاریەی بڵێ ئەمە کچی منە جێ بەجێ ئازاد دەبن با بەبەندەو جاریەکەش بەساڵ لەسەیدی خۆیان گەورەتر بن.

٦٦٦- «عن ابي هُريرة ﷺ اذا اتى أَحَدَكُمْ خادِمَهُ بِطَعامِهِ فانْ لَمْ يُجْلِسْهُ مَعَهُ فَلْيُناوِلْهُ لُقْمَةً أو لُقْمَتَيْن أو أُكْلَةً أو أُكْلَتَيْن فانَّه وَلِيَ عِلاجَهُ».

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی وەکو بۆ یەکێکتان خزمەتکارەکەی خواردنی بۆ هێنا ئەگەر لەگەڵ خۆی داینەنیشاند با پارۆیکی لە

خواردنەکەی پیبدا یا فەرمووی دوو پارووی پێ بدا چونکی خزمەتکارەکەچاودێری خواردنەکەی کردووە بە دروست کردن و پێوە ماندووبون بۆنی دووکەڵ و ئەزیەتی پێوە کێشاوە.

(ش) ئەگەرچی ئامادە کردنی خواردن لە لایەن نۆکەر خزمەتکار ئەمرێکی ئەغلەبی دایمی نیە ئەمر لەم حەدیسە هەر بۆ نەدبە (واتا هاندانە لەسەر چاکە) با خواردنەکەش لە لایەن خزمەتکارەکە دروست نەکرابێ. لای قسەی راجحی ئیمامی شافعی. دانیشاندن باشترە واتە نۆکەرەکە لەگەڵی دابنیشی بۆ خواردن ئەگەر پاروشی بۆ کرد ئەبی بۆی لە چەوری وەر بدا. دەبی پاروەکەش گەورە بێ هەتا ئارەزووی خواردنی نەهێڵێ نەك بچووك بێ هەوەسی بۆ خواردن زیاتر بکات.

٦٦٧- ((عن ابي هريرة ﷺ اذا قَاتلَ احَدَكُمْ فَلْيَجْتَنِبْ الوَجْهَ)).

تەرجەمە

دەگێرنەوە لە ئەبو هورەیرە ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی وەکو یەکێك لە ئێوە لە خزمەتکارەکەی خۆی یا لە کەسێکی تری دا با خۆی بپارێزێ لە رووی نەدا.

(ش) لێ نەدان لە رووی موسوڵمان لەبەر ئەم حەدیسە(ان الله خلق آدم على صورته) چونکی ضمیر ئەگەر چی لای هەندێکان دەگەریتەوە وەبال لێدراو. بەڵام لای هەندێکانیش دەگەڕێتەوە لای خودای گەورە یەعنی دروستی کردووە لەسەر صفاتی خۆیلە عیلم و قودرەت و ئیرادەو حەیات و گوێ لێ بوون و دیتن و غەیری ئەمانەش کە صورەتی ئەزەلیەن ئنجا ئەگەر چی بەشی زۆری خەڵك لەسەر مەعنای پێشوون بەڵام ئەوی پەسەندە مەعنای پاشووە لەبەر پێشکەوتنی وێنە لەسەر کێشراو لەسەر وێنەکێشراو(مصور عليه على المصوَّر)

## ((كتاب المكاتب))

## باسی نووسینەوە (ئازاد کردنی بەندە)

٦٦٨- ((عن عائشة ﵂ ابتاعي فاعتقي انَّما الولاءُ لِمَنْ اعْتَقَ ثُم قَامَ رسولُ اللهِ صلى الله تعالى عليه وسلم فقال ما بالُ اناسٍ يَشْتَرِطونَ شروطاً لَيْسَت في كتابِ اللهِ عز وجل فَلَيْسَ لهُ وان اشْتَرَطَ مائة شَرْطٍ شَرْطُ اللهِ أحَقُّ وَاوفَق واوثَق)).

### تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە (رەزای خودای لێ بێ) بەم تەرزە بەریرە کە جاریە بوو بۆ سەیدەکەی کتابەتی لەگەڵ کرد بە مودەی نۆ ساڵ هەر ساڵێك قستێکی پێبدا دا ئنجا ئازاد ببێ. بەریرەش لە پێش ئەمە کە لەجیاتی کتابەتەکەی شتێك بە سەیدەکەی بدا هاتە خزمەت حەزرەتی عائشە لە جیاتی کتابەتەکەی یاریدەیێکی بدا چونکی لە پێش کرینیش خدمەتی عائشەی دەکرد. حەزرەتی عائشەش فەرمووی بچۆ بۆ لای ئەهل و خاوەنت پێیان بڵێ ئەگەر حەز دەکەن من تۆلەی هەموو کتابەتی تۆ بەیەك جار دەدەم ئازادیشت دەکەم بەم مەرجە ببی بەئازادکراوی من وەلای تۆ بۆمن بێ یەعنی نکاحو میراتو هەموو حوکمێکی شەرعی تایبەت بە عەتیقە (بەندەی ئازادکراو) عائد بەمن بێ بەریرە گەڕاوە لای خاوەنەکانی قسەی حەزرەتی عائشەی بۆ گێڕانەوە نەیان هێشت ئەم قسەی عائشە یان پێ خۆش نەبوو گوتیان حەزرەتی عائشە ئەگەر بەخێری خۆی نرخی تۆ بە ئیمە دەدا باشە بەڵام دەبێ وەلای تۆ هەر لەدەست ئیمەدابی. حەزرەتی عائشە حیکایەتەکەی بۆ پێغەمبەر کرد ﷺ فەرمووی بە عائشە تۆ بیکڕەو ئازادی بکە وەلا بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی دەکا اشتراطی وەلا بۆ ئەوان لەپاش کڕینی تۆ هیچ نەفعیکی بۆ ئەوان نییە پاشان پێغەمبەرﷺ هەستا بەخەطیبو دواندەر لەبەینی ئەصحاب ﷺ فەرمووی چییە حاڵی ئەو کەسانەی لە کڕینو فرۆشتن

هەندێ شت دەکەنە مەرج کە کتـابی خـودا نیـیە. هەرکەسێك شتێك بکاتـە مـەرج لـە کتابی خوای گەورەدا نەبێ هیچی بۆ نییە یەعنی بەتالە. بەشەرع موعتەبـەر نیـیە. با سەد جاریش ئەو شتە بکاتە مەرج. شەرتێك کە خودا فەرموویەتی ئەو لایقترو موافیقـتر و موحکەمترە لەو شەرتەی کە خەڵك دایدەنێن شەرتەکان بێ هێنن.

(ش) لای ئیمامی ئەحمـەد ﷺ ئـەوەی وەرگرتـووە لـەظاهری ئـەم حەدیسـە فرۆشتنی کۆڵەی موکاتب بەرەزای خۆی دروستە. قیمەتی کتابەتەکەی پێ بدرێ یا پێ نەدرێ. چونکی لەم حەدیسە بەریرە شتێك کە موشعیر بەوە بی کـە پـێی جـێ بـەجێ نەکرێ بەصەراحەتو ئاشکرا نییە، بەڵام ئیمامی ئـەعزەم و ئیمـامی شـافعیو هـەندێ مالکیەکان موکاتەب: واتە ئەو بەندەی کە دەیەوێ خۆی بکڕێتەوە هەتا لە دانیْ نرخـی خۆی عاجز نەبێ فروشتنی دروست نییە گووتوویانە بەریرە لەبەر ئـەوەی ئـەو نرخـەی پێ نەدەدرا کە لە گەڵ گەورەکەی خۆی پێك هاتبوو بۆیە پـەنای بـردە بـەر حـەزرەتی عائشە. بەڵام شافعی ﷺ گووتیتی ئەگەر کۆڵەی ژن یا پیاو کە بیەوێ خۆی بکڕێتـەوە لە گەورەکەی هەردو لا رازی بن بە فرۆشتن فرۆشتنەکەی دروستە چونکی ئەمـە تەرکـە بۆ خۆ کڕینەوە ئنجا با هەشی بێ کە خۆی پێ بکڕێتـەوە هـەر وەکوو لـەم حەدیسـەی بەریرە وا رووی داوە چونکی بـەریرەو خاوەنـەکانی رەزایـان لەسـەر هـەبوو حـەزرەتی عائشە بیکڕێ. بۆ صحتی کتابـەت شـەرتە دەبـێ ئـەو کەسـەی دەیـەوێ تەبـەروع بکـا کۆمەلە کۆلەیەك ئازاد بکا بە کتابەت واتە بەندەکان خۆیـان بکڕنـەوە لـە گـەورەکانیان کتابەتو کڕینەوەی هەندێکیان دروست نییە چونکی موستەقیل و سـەربەخۆ نـابێ لـە گەڕان بۆ تەحصیلی ئەقساطو بەدەلەکەی. وە دەبێ بیشڵێ لەگەڵ لەفظی کتابەت هەر وەقتێك قسطە کانت دا تۆ حر وئازاد دەبی وە دەبێ کۆڵەی موکاتبیش بڵێ قبوولم کرد وە دەبێ عیوەضیش (واتە نرخی تۆلە) مەعلوم بێ وە دەبێ لای کـەمی مونەجـەم بـێ بە دوو نەجم ئەگەر زیاتر نەبێ چونکی عادەتی صەحابە وا جاری بووە. جایز نییە بـە

عیوەضی حاڵی یا مونەجەم بێ بەیەك نەجم(واتە بەدەلەکەی بەیەك قسط بداتەوە) لای ئیمامی شافعی حوکم وایە. بەڵام حەنەفییەکان و مالکیەکان دروستە لای ئەوان بە حاڵو بە مۆجەلی وە بە یەك نەجم(قسط) و دوو نەجمیش. فەهم دەکرێ بە حەصری (انما الولاء لمن اعتق) وەلا بۆ ئەو کەسە نییە کە لەسەر دەستی موسوڵمان بووە هەربۆ موعتیقە واتا ئەوەی ئازادی کردووە.

# ((کتاب الهبة))

# باسی بەخشین

# بسم الله الرحمن الرحیم

٦٦٩- ((عن أبی هُریرة ﷺ یا نساءَ المُسْلِمات لا تَحْقِرنَّ جارةٌ لِجارَتِها وَلَو فِرە سِنَ شاةٍ)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی ئەوان ژنانەی کە موسوڵمانن بابە کەم نەزانێ ژنی جیران دیاری بۆ ژنی جیرانی خۆی با بەسمە مەڕێك بێ کە نەختی گوشتی پێوە بێ: یەعنی با نەڵێ. دیاریەکەم چونکی زۆر کەمە شەرم دەکەم بینێرم یا خۆ ئەوەی دیاری بۆ دەچی با کەمیش بێ بابەکەمی نەزانی دیاری با کەمیش بێ بەکەمی نەزانی چونکی دیاری خۆشەویستی پەیدا دەکا چونکە پێغەمبەرﷺ دەڵێ: ((تهادوا تحابوا)) واتە دیاری بدەنە یەکتر یەکترتان خۆش دەوێ.

٦٧٠- ((عن ابي هريرة ﷺ قالَ لَو دُعِيتُ الی ذِراعٍ او كِراعٍ لأجَبْتُ وَلَوْ اهْدِيَ اليَّ ذِراعٌ او كِراعٌ لَقَبِلْتُ)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووی ئەگەر دەعوەت بکرێم بۆ باسکە مەڕێك یا بۆ قاچە مەڕێك دەعوەتەکە قبوول دەکەم وە ئەگەر بە دیاریش بۆم رەوانە بکرێ باسکە مەڕێك یا قاچە مەڕێك قبوولی دەکەم یەعنی هەدیەو هبەی شتی کەموو زۆر. لای من مەقبوولە مە سەلێکی کوردیە دیاری کەمی و زۆری بۆنییە.

٦٧١- ((عن ابي هُريرة ﷺ أهديةٌ أم صَدَقَةٌ فان قيلَ صدقةٌ قَالَ كُلوا وَلَمْ يأْكُلْ)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرە ﷺ لەلایەك ئەگەر شتێك بۆ پێغەمبەرﷺ بهاتایە پرسیاری دەکرد ئەمە صەدەقەیە یاخۆ هەدیەو دیارییە. ئەگەر بگوترابایە صەدەقەیە یا زەکاتە دەی فەرموو ئێوە بیخۆن خۆی نەی دەخوارد ئەگەر هەدیەش یا دیاری بوایە لەگەڵ یارو ئەصحابی خۆی دەیان خوارد چونکی صەدەقاتو زەکاتی حەرام کردبوو لە خانەدانی پێغەمبەرﷺ هەتا لە بەندەو جاریەو عەتیقو عەتیقەش (واتە بەندەی ئازاد کراوی پیاوو ئافرەت) لە تەفصیلاتی باسی زەکات رەت بوو.

٦٧٢- ((عن ابن عبَاسٍ ﷺ قالَ أَهْدَتْ أمُّ حُفَيْدٍ خالَةُ ابن عبَاس الى النبى صلى الله تعالى عليه وسلم اقطاً وسَمْناً وَ أضُبَّاً فَأَكَلَ النبيُّ صلى الله تَعالى عَلَيْهِ وَسَلمَ مِنَ الأَقْطِ والسَّمْنِ وَتَرَكَ الأَضُبَّ تَقَذُّراً)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە عبد الله ی کوڕی عباس ﷺ گوتی ئومی حوفەید کەناوی هوزەیلە خوشکی دایکی ئیمانداران حەزرەتی مویمونە بوو پلکی عبد الله ی کوڕی عباس بوو بە دیاری هەندێ کەشكو رۆن و چەند بزن مشکێکی رەوانە کرد بۆ

پێغەمبەرﷺ (بزن مـژك حەیوانێكـە ئـاو ناخواتـەوە هەیـە هـەتا حەوسـەد سـالْ دەژی زیاتریش گوتـراوە لـەماوەی چـل رۆژ یـەك قـەترە مـیز دەكـا ددانـی ناكـەوێ ئنجـا پێغەمبەرﷺ لەكەشكو رۆنەكەی خوارد لە بەر بیز لیْ كردن بزن مژەكەی نەخوارد.

ابن عباس فەرموویەتی بزن مـژك لەسـەر خوانـی پێغەمبـەرﷺ خـوراوە. ئەگـەر حەرام بوایە لەسەر سفرەی پێغەمبەرﷺ نەدەخورا.

ئیمامی شافعی گوتیتی حەدیسی ابن عباس رێك دەكەوێ لەگـەڵ حەدیسـی ابـن عمر ﷺ كە گوتیتی پێغەمبەرﷺ بـزن مشـكی نـەخواردووە. چونكـی بـێزی لیْ كـردووە نەك حەرامە كەوایە خواردنی گۆشتی بزن مشك حەلاڵە خواردنی پێغەمبەریش لە كەشك و روونەكە دەلیلە لەسەر قبوولی هەدیە.

٦٧٣- ((عن أنَسٍ ﷺ هُوَ لَهاَ صَدَقَةٌ وَلَنَا هَدِيَّةٌ)).

**تەرجەمە**

دەگێرنەوە لە ئەنەس ﷺ گوتی هەندی گوشتی كۆلاویان بۆ پێغەمبەرﷺ نارد پیْ یان گوت ئەی پێغەمبەری خودا ئەم گوشتەیان بەصەدەقـە بـۆ بـەریرەی عەتیقـەی حەزرەتی عائشە نارد ئەویش بۆ تۆی نارد فەرمووی ئەم گۆشتە بۆ ئەو صەدەقەیە بۆ ئیمەش دیاریـیە. یـەعنی بـەریرە كـە عەتیقـەی (واتـا پـەندەی ئـازادكراوی) عائشـەیە صەدەقەی لیْ حەرام نییە چونكی عائشە ئەگـەر چـی لەژنـەكانی پێغەمبـەرە بـەلام لـە بەنی هاشم و بنی مطلب نەبوو وە بۆ ئێمەش حەرام نییە چونكی بەریرە بەصەدەقەی بۆ ئیمە نەناردووە بە دیاری بۆ ئیمەی ناردووە. دیاری و هەدیەش بۆ ئێمـە حەلاڵـە لای قەولێكی ئیمامی حەنەفی هەر زەكاتی فەرز حەرامە هەرچی لە نەوعی خـێرو صەدەقـە بیْ حەلاڵە.

٦٧٤- «عن عائِشة ﷺ لا تُؤذِيني في عائِشة فانّ الوَحْيَ لَمْ يأتِني وَأنا في ثَوْبِ امرأةٍ الاّ عائِشة قَالَهُ لأُمِّ سَلَمَة، يا بُنَيَّة ألا تُحبِينَ ما أحِبُ قَالَتْ بَلىَ قَالَهُ لِفاطِمَة. وَقَالَ إنها بِنْتُ أبى بَكر قَالَهُ لِزَيْنَبْ في عائِشَة».

تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە (رەزای خودای لێ بێ) ژنەکانی پاکی پێغەمبەرﷺ دوو بەش بوون بەم تەرزە حەفصەی کچی حەزرەتی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) وە سەودەی کچی زەمعە وە صەفیەی کچی حویەی لای عائشە بوون. ئەوانی تریش زەینەبی کچی جەحش، مەیمونەی کچی حارث وە ئومی حەبیبەی کچی ئەبو سفیان وە جوەیریەی کچی حارث ئەمانەش لای ئومی سەلەمە بوون. موسوڵمانیش هەموو دەیانزانی خۆشەویستی بەدڵی پێغەمبەرﷺ دەرحەق بەحەزرەتی عائشە لە وانیتر زیاترە. ئەگەر چی لە عەدالەتو قیسمەتیش فەرقی نەدەکردن. ئەنجا کەسێك ئەگەر فکری بوایە دیاری یەك بۆ پێغەمبەرﷺ ببا. چاوەڕێی دەکرد لە نۆبەتی عائشە بۆی دەبرد. جەماعەتی ئومی سەلەمە بە ئومی سەلەمەیان گوت بە پێغەمبەرﷺ بڵێ کە بەخەڵکی بڵێ لە هێنانی دیاری هەرکامێك ڕێك کەوت دیاری بینن. ئومی سەلەمەش قسەی ئافرەتانی پێ گوت لە نۆبەتی خۆی هیچ وەڵامی نەداوە. دووبارە بەئومی سەلەمەیان گوتەوە کە ئەم قسەی پێ بڵێتەوە وەکوو گەیشتە نۆبەتی خۆی. دیسان پێی گوتەوە دیسان هیچ وەڵامی نەداوە ژنان ووتیان پێغەمبەرﷺ وەڵامی چی بوو گوتی ئەمە دوو جارە من پێی دەڵێم هیچ وەڵامی نەدامەوە گوتیان ئەم جارەش دەبێ پێی بڵێ بەڵام وازی لێ نەینی هەتا وەڵامت نەداتەوە. ئەم جارەی سێ یەمیش وە کوو نۆبەتی گەیشتی، پێ ێ گوت پێغەمبەرﷺ بە ئومی سەلەمەی گوت تۆ من ئەزیەت مەدە بەسەبەب ڕێزگرتنی من بۆ عائشە چونکی هیچ لە فراشی ئافرەتێکی خۆم وەحیم بۆ نەهاتۆتە خوارێ لای عائشە نەبێ. ئومی سەلەمە گوتی من

تۆبە لە ئەزیەت دانی تۆ ئەی پێغەمبەری خوا پاشان جەماعەتی ئومی سەلەمە داوایـان کرد لە حەزرەتی فاطمە (رەزای خودای لیّ بیّ) بۆ لای باوکی چوو لای حەزرەتی عائشە بوو. قسەی ژنانی پـێ گـوت: گوتـی ژن دەڵێـن بـە خـودا داوای لیّ دەکـەین دەربـارەی خۆشەویستی عەدالەتی هەبێ لە بەینی ئێمەو کچی ئەبو بکـر. پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی ئەی کچی خۆشەویستم تۆش ئەو کەسەت خـۆش نـاویّ کـە مـن خۆشـم دەویّ؟ فاطمە گوتی (بەڵیّ). فاطمە گەڕاوە لای ژنان جوابەکەی بۆ گێڕانەوە بە فاطمە یان گـوت ئەم جـارەش بچووە بـۆ لای گوتـی نـاچم. زەینـەبی کچـی جەحشیان نـاردە لای خدمـەت پێغەمبەرﷺ قسەی بە توندی لە گەڵ کرد. گوتی ژنەکانت بە خودا داوات لیّ دەکەن کە لەگەڵ کچی ئەبی قوحافە لە خۆشەویستی فەرقیان نەکەی (ئەبو قوحافـە بـاوکی ئـەبو بەکر بوو ناوی عثمان بوو ﷺ) بەدەنگ بەرزی حـەزرەتی عائشـەی داگـرت بـە قسـەی ناشیرن وجنێو هەتا بە غایەتێك پێغەمبەر تەماشای عائشـەی دەکـرد ئایـا قسـە دەکا ئنجـا حـەزرەتی عائشـە بەقسـە رەوانـی خـۆی رەدی لـە زەینـەب داوە بەدەرەجەیەك عباراتی بەلیغەی هەڵڕێژت. سکوتی بە زەینەب کرد. پێغەمبـەرﷺ تەماشـای عائشـەی کرد فەرمووی بەڕاسـتی عائشـە کچـی ئـەبو بـەکرە. یـەعنی شـەریفەیەو عارفەیـە(واتـە بـەڕێزەو زانایـە) و بـە بـاوکی خـۆی دەچـێ لـە شـەرەفـو مەعرفـەت و عـەقڵو علـم بەئەنسابی عەرەب و مناقب و مەعایبی بەنی موضـەر چونکـی منـداڵ لەسـەر رەوشـتی باوکێتی. (ومن يشابة أباة فما ظلم) لەم حەدیسە پیرۆزە گەورەیی و ڕێزێکی زۆر فەهم دەکریّ بۆ حەزرەتی عائشە (رەزای خودای لیّ بیّ). لەگەڵ ئەمـەش پێغەمبـەرﷺ هەر دیاریەك بهاتایە بە عەدالەت بەسەر هەموو ژنە پاکـەکانی خـۆی دابـەش دەکـرد. بـەڵام ئافرەتەکان وایان پیّ خوش بوو لای ئەوان بۆ عائشە بچیّ. فەهمیش کرا بۆ پیـاو هەیە سـکوت بکـا لـە بـەینی ژنـان وەکـو لەگـەڵ یـەکتری کەوتنـە قسـە بـەبێ مـەیل لەگـەڵ هەندەکان. بەلای هەندەکان وەکو سکوتی پێغەمبەرﷺ وقسە نەکردنی لـە کـاتی گفتو

گوی زەینەبو عائشە. ئاخری قسەیان فەرمووی کچی ئەبوو بەکرە. لەمەشدا اشارە هەیە وەبال شەرەف و گەورەیی حەزرەتی عائشە وە فەهمیش کرا نازی زەینەب لەسەر پێغەمبەرﷺ یەعنی جورئەتی کرد قسە بکا لەبەر خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ بۆ ئەو پشتی بەم خۆشەویستنە بەستابوو چونکی زەینب کچی ئومەیمەی پووری بوو کە ئەویش کچی عبد المطلب بوو. وە فەهمیش کرا پیاو موکەلەف نیە بەتەسویە لە بەینی ژنان بە خۆشەویستی چونکی خۆشەویستی کارێکە پەیوەندی بە دڵو دەرونەوە هەیە لە دەست خودایە (ان الله يحول بين المرء وقلبة) وەفەهمیش کرا ژنەکانی پێغەمبەرﷺ زۆر بەحەیاومەند بووینە دەرحەق بە پێغەمبەرﷺ بۆیی بەخۆشەویسترین کەس لای پێغەمبەرﷺ کە فاطمەیە موراسەلەیان لەگەڵ کرد. ئەم حیکایەتە لە کتێبی عەینی جلدی ٦ ص ٢٦٧ باس دەکا. واش زاندرا لەم حەدیسە لە کاتێك باشە کە دیاری ببەی بۆ یەکێك کە ئەو کەسە لە خۆشی دا بی و خۆشیەکەی زیاد بکا.

٦٧٥ – «عن النُّعْمانِ بنِ بَشِيرٍ ﷺ أَعْطَيْتَ سائِرَ وَلَدِكَ مِثْلَ هذا. قَالَ:لا. قَالَ فاتَّقُوا اللهَ واعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلادِكُمْ».

## تەرجەمە

دەگێرنەوە لە نعمانی کوڕی بەشیری کوڕی سەعدی کوڕی ثەعلەبەی کوڕی جەلاسی ئەنصاری خەزرەجی گوتی باوکم بشیر بەخشیشێکی لەگەڵ کردم (لە سەر اختلاف یا عەبد بوو یا جاریە بوو یا حەدیقە بوو) بەرجای عەمرەی کچی رەواحەی دایکم لە باوکم بشیر. پاشان عەمرەی دایکم گوتی رازی نابم تا پێغەمبەرﷺ نەگیرێ بەشاهد لەسەر بەخششەکە بۆ اثبات بوون. ئنجا بشیر هاتە لای پێغەمبەرﷺ گوتی من عەبدیك یا جاریە یا حەدیقەیەکم بەنعمان کوڕی خۆم داوە کە لەعەمرەی کچی رەواحەیە وە ئەمریشی پێ کردوومە عەمرە کە تۆ بگیرم بە شاهید. پێغەمبەرﷺ فەرمووی بەلی پرسینەو ئەری بەقەدەر ئەمەندەی کە بەنەعمانت داوە،بەمنداڵەکانی

تریشت داوه: بشیر گوتی نا. پێغەمبەرﷺ فەرمووی خۆتان بپارێزن لە عەزابی خودا عەدالەت بکەن لەبەینی ئەولادان. بشیر لە خزمەت پێغەمبەرﷺ گەراوە بەخششەکەی لەنعمان رەد کردەوە. بەم حەدیسە تەمەسوکی کردەووە ئەو کەسەی واجبی کردووە یەکسانی(تسویە) لە بەخشش بە مندالآنی خۆت. بوخاری بەمە تەصریحی کردووە. ئەمە مەزهەبی طاووس و ثەوریە.

لای جمهوریش ئەمر حەمل کراوەتە نەدبو نەهی لەسەر تەنزیە. کەوایە مەکروهە باوکو باپیر شتێك زیاتر بەیەك لە ئەولادەکانی تربیدا. یەعنی یەکسانی نەکا لە بەینی مندالّەکانی بەبێ فەرق لە بەینی نێرو مێ چونکی هبە وەکوو میرات نییە ﴿فللذکر مثل حظ الانثیین﴾ بێ. واتە منالّی نێر دوو هەندێ منالّی مێ ببا یا هەر نێرێك دوو ئەوەندەی مێ ببا. چونکی میرات بە فەرزو تەقسیمی خودایە وەلەبەر ئەمەش نێرو مێ لە میراث بە عەصەبە فەرقیان هەیە. بەلآم بە موجەرەدی رەحم فەرقیان نییە وەکوو إخوەتو أخواتی لأم (واتا وەکو براو خۆشکی لە دایك) هبەش بۆ ئەولاد لەبەر صلەی رەحم ئەمری پێ کراوە بەلآم ئەگەر لە پێویستیو موحتاجی فەرقیان هەبێ هەندێکان بە پێش بیخی زیانی نییە. ئەمە شافعیو حەنبەلی بەم حەدیسە استدلالیان کردووە لەسەر جەوازی گەرانەوەی باوك لەوشتەی کە بە مندالّی خۆی داوە. ئیمامی ئەعزەمی گوتیتی دروست نییە. ئەم گەرانەوەش بۆیە لێرەدا وە چونکە بەخششەکە نەدراوە هەر وەعدو بەلّێن بووە.

٦٧٦- ((عن ابن عباس ﷺ العائِدُ فی هِبَتِهِ کَالْکَلْبِ یَعُودُ فی قَیْئِهِ)).

## تەرجەمە

دەگێرنەوە لە عبداللەی کوری عباس ﷺ گوتی پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەو کەسەی بگەرێتەوە لە هبەی خۆی وەکوو سەگە برشێتەوە پاشان بگەرێتەوە رشانەوەکەی خۆی بخواتەوە.

بەمە احتجاجیان کردووە ئیمامی شافعی و ئەحمەد لەسەر دروست نەبوونی پەشیمان بوونەوەی غەیری باوك دەرحەق بەمندالّی خۆی لە هبە. لای ئیمامی مالك دروستە بێگانە پەشیمان ببێتەوە لە هبە ئەگەر مەبەستو مەقصودی پاداشت بووبێ. ئیمامی ئەحمەدیش بەمە حوکمی کردووە لە ریوایەتێك چونکی دەڵێ خێر ناکەم ئەبوو حەنیفەش فەرموویتی بۆ ئەو کەسە هەیە کە هبە دەکا لە هبەی بێگانە پەشیمان بێتەوە مادام عەینی ئەو شتە مابێ کە هبە کراوە. تە عویض ناکرێ لەم حەدیسەش وەلاّم دراوەتەوە تەشبیە لە رشانەوە لەبەر حورمەتی شەرعیە نییە بەڵکی لەبەر ناپیاوەتی و بێ ئەخلاقی و بەد رەوشتییە گویا وەکوو رشانەوە پیسە نەك حەرامە چونکی سەگ مەحکومی حەلاڵ و حەرام نییە.

٦٧٧- «عَنْ مَيْمُونةَ ﵂ أوَ فَعَلْتِ أم ا انَّكِ لَوْ أَعْطَيْتَها أخوالَكِ كانَ أعْظَمَ لأجْرِكِ قَالَ لَهاَ لمَا قالَتْ اعْتَقْتُ وَلِيدَتي».

## تەرجەمە

دەگێرنەوە لە دایکی ئیمانداران هلالیە مەیمونەی کچی حارث ﵂ جاریەکی خۆی ئازاد کرد بێ ازن خواستن لە پێغەمبەرﷺ لە نۆبەتی خۆی پێی گووت. ئەری تۆ زانیت من جاریەکەی خۆم ئازاد کرد پێغەمبەرﷺ فەرمووی ئەری بەڕاستی ئازادت کرد مەیمونە گوتی (بەڵێ) فەرمووی بەڕاستی ئەگەر ئازادت نەکردایە بە خاڵەکانی بەنی هیلالی خۆت بدایە خێرت گەورەتر بوو.

(ش) ئەوەی لەم حەدیسە بزاندرێ ئەوەیە هبە بەخزمی دایك (ذوی الارحام) خێرو چاکەی زیاترە لە ئازاد کردن لەبەر ئەم حەدیسە «الصدقة عَلى المُسْلمينَ صَدَقَةٌ وَعلى ذَوي الأرْحامِ صَدَقَةٌ وَصِلةٌ» بەلاّم قسەی حەق بەتەواوی وا نییە. بەڵکی اختلاف دەبێ بە اختلافی ئەحوال، لێرە چونکی خاڵەکانی مەیمونە زۆر پێویست بوینە بۆ نۆکەرێك. بۆیە لە ئازاد کردن گەورەترە ئەگەر نا ئازادکردن گەورەترە وە لەم

حەدیسەش زاندرا کە ژنی گەورەو عــاقلْ ئەگـەر مـالّی خـۆی بـەکار بینـی بـەو شـێوەی دەیەوی بە بیْ ئیزنی میردیش دروستە.

٦٧٨- ((عن المِسْورِ ابنِ مَخْرَمَةَ ﷺ خَبّأنا هذا لَکَ:رَضِيَ مَخْرَمَةُ)).

## تەرجەمە

دەگێرِنەوە لە میسوەری کـوڕی مەخرەمـەی کـوڕی نەوفـەلی زهـری ﷺ گوتـی پێغەمبەرﷺ هەندیْ کەوای لە ئەصحاب دابەشی هیچ کەوای بەمەخرِەمە نەدا لە کـاتی دابـەش کـردن مەخرِەمـەش بـە میسـوری گـوت کــوڕم لەگــەڵم وەرە بچینــە خزمــەت پێغەمبەرﷺ بەڵکی کەواییْکیشی بە ئێمە دەدا. مسـوری گوتـی لـە گـەڵی چـووم پـیْی گوتم تۆ بچۆ ژووری پێغەمبەرم بۆ گاز بکە. منیش ئەم قسەی مەخرەمــەم زۆر لا گـەورە بـوو عەجـەبا پێغەمبـەرﷺ چلـۆن گــازی دەرەوە دەکـریْ. مەخرِەمــە گوتــی کــوڕم پێغەمبەرﷺ لە پاشایانی زۆردارو بەدەعیە نی‌یە. ناچار لەبـەر فـەرمانی بـاوکم چوومـە ژووریْ پێم گوت باوکم مەخرِەمە لـەدەرەوە چاوەڕیتـان دەکا پێغەمبـەرﷺ تەشـریفی هاتە دەریْ کەواییْکی لەبەر بوو لەبەر خۆی کردەوە بەمەخرِەمەی فەرموو ئەم کەوایەم بۆ تۆ بە پەنا دابوو. مەخرِەمە زۆر مەمنون بوو.

(ش) لەم حەدیسە وەردەگیریْ گواستنەوەی کەل‌و پــەل بـۆ ئـەو کەسـەی دەی دریتی بەوەرگرتنە. بۆ صحەتی هبە عەجەبا وەرگرتن مەرجــە یـا مـەرج نی‌یـە اختـلاف هەیە. لای جمهور کە قەولّی جەدیدی شافعی یە و لای خەڵکی کوفە ئەو کەسەی هبەی دەدرێتیْ نابێتە خاوەن شتەکە بەوەرگرتن نــەبیْ لای قـەولی قـەدیمی شـافعی بەهـەمان عەقد بەبیْ وەرگرتن هبە راستە. ئەمە مەشـهوری مەزهـەبی مالکیەکانـە. بـەڵام هبەکە بەتالْ دەبێتەوە ئەگەر ئەو کەسەی هبەکەی دراوەتی هبەکەی وەرنەگریْ لــەو کەسـەی پـیْی بەخشـیوە. لــە پێـش بەخشـینی بــە یــەکێکی‌تر و وەرگرتنــی. لای ئیمــامی

ئەحمەدیش بەهەمان عقد بێ ئەوەی وەری بگری راستە بە ئیزنی ئەو کەسەی هبەکەی کردووە لازم دەبێ بەتاڵیش نابێتەوە.

٦٧٩- العن ابن عمر ﷺ إني رأيتُ عَلى بابِها سِتْرا مَوْشِيًا مالى وَلِلدنيا ترسِلُ بِهِ الى فُلان أهْلَ بَيْتٍ بِهِم حاجَةٌ».

## تەرجەمە

دەگێرنـەوە لـە عبـدالله ی کـوری عومـەر ﷺ گوتـی پێغەمبـەرﷺ هاتـە مـاڵی فاطمەی کچی خۆی. نـەچووە ژوورێ حـەزرەتی عـەلیش تەشـریفی هاتـەوە فاطمـە ش قسەی هاتنو گەرانەوەی پێغەمبەری بۆ گێرایەوە. حەزرەتی عەلی ئەسبابی گەرانەوەی لە پێغەمبەرﷺ پرسی فەرمووی لەسەر دەرگەی فاطمە پەردەیەکی رەنگاو رەنگم چاو پێ کەوت. فەرمووی من لەکوێ و دونیا لە کوێ. چی مناسەبەمان هەیە حەزرەتی عەلی ئەم قسەی پێغەمبەری بۆ فاطمە گێرایەوە فاطمە گوتی با ئەمرم پێ بکا چی لێ بکـەم. پێغەمبەرﷺ ئەوشتی کە بۆ خۆی ناخۆش بوو بۆ فاطمەی کچیشـی پـێ نـاخۆش بـوو. چونکی لەپەردەکە وینەو نەخش و رازاندنـەوە هـەبوو. بـۆ خانـەدانی پێغەمبـەرﷺ بـە نالایقی زانی. ئەگەر حەرام بوایە لەبەر خەتو جوانی بـۆ ماڵەکـەی موحتـاج بەشمـەکی لەبەرکردن نەی دەنارد. ئنجا شتی حەرام ما دام وەرگرتنی مـەمنوع بـێ بەخشینیشـی مەمنوعە. دیارە هەر مەبەستی پاراستن لەبەر خواپەرستی بـووە بـۆ ئـەهلی بـەیت. بـە دەلیلی ﴿قل مَنْ حَرَّمَ زينَةَ اللهِ التي اخْرَجَ لِعِبادهِ وَالطَّيباتِ مِنَ الرِّزْقِ﴾.

٦٨٠- العن عبد الرحمن ابن ابي بكر ﷺ هَلْ مَعَ أحَدٍ مِنْكُمْ طَعامٌ ثُمَّ جَاءَ رَجُلٌ مُشْرِكٌ مُشْعارٌ طَويلٌ بِغَنَمٍ يَسُوقُها. فَقَالَ بَيْعاً أمْ عَطِيَّةً. أو قالَ أم هِبَةً. قالَ لا، بَيْعٌ. فاشتَرى مِنْهُ شاةً فضعت. وأمَرَ النبى صلى الله تعالى عليه وسلم بِسَوادِ البَطْنِ انْ يَشْوى وأيم الله ما فى الثلاثينَ والمئاةِ الاَ وَقَدْ حَزَّ النبى صلى الله تعالى عليه وسلم لَهُ

حَزَّةَ مِنْ سَوادِ بَطنِها انْ كانَ شاهِداً أعْطاها ايّاه وانْ كانَ غائِباً خَبَّاء لَهُ فَجَعَلَ قَصْعَتَيْنِ فَاكَلُوا أجْمَعُونَ وَشَبِعْنا فَفُضِلَتِ القَصْعَتانِ فَحَمَلْناهُ على البَعِيرِ أو كَمَا قَالَ)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لەعەبد الرحمن کوڕی حەزرەتی ئەبو بەکر. ﵄. گوتی ئێمە سەدو سی کەس بووین لەخزمەت پێغەمبەرﷺ فەرمووی ئەری لای یەکێکتان خواردن هەیە لای پیاوێك صاعیك خواردن هەبوو کرا بەهەویر. پاشان پیاوێکی موشریکی پرچ مشوەشی بەژن درێژ بە مێگەلە مەڕێکەوە هات پێغەمبەرﷺ فەرمووی ئەم مەڕە بۆ فرۆشتن دەدەی یا فەرمووی بەبەخشین (عطية) دەدەی یا فەرمووی بە هبە دەدەی موشریك گوتی بەهبە نادەم دەی فرۆشم پێغەمبەرﷺ مەڕێکی لێ کڕی. کوژرایەوە ئەمرێ فەرموو جەرگەکەی ببرژێنن. جەرگەکەیان برژاند. بەحەقی خودا قەسەم ئەم سەدو سی کەسە هەریەکێك پارچەیەکی لەم جەرگە پێدا. هەرکەسێ لەوێ بوو وەری گرت ئەوی لە ویش نەبوو بۆی هەلگرت. پاشان مەڕەکە کرا بەخواردن لە دوو کاسە کرا. ئەم سەدو سی کەسە بوون بە دوو فیرقە لەسەر ئەم دوو کاسە بەعمومی خواردیان. وەهەر هەموومان تێر بووین خواردن لەناو کاسەکان بە زیادی مابووەوە لەسەر ووشتر بارمان کرد.

(ش) لەم حەدیسە سێ موعجیزە هەیە:

یەکی‌یان: یەك جگەری برژاو سەدو سی کەس لێ بخوا.

دووەم: لەیەك صاع خواردن ویەك مەر ئەم ژمارە لەشکرە تێربخوا.

سێیەم: کاسەکان بە زیادی خواردنیان تیا مابوو لەسەر ووشتر بارکران.

٦٨١- «عن أسماءَ ﷺ قالَتْ قَدِمَتْ عَلَيَّ أُمِّي وَهِيَ مُشْرِكَةٌ فى عَهْدِ رسولِ اللّهِ صلى اللّهُ تعالى عَلَيْهِ وَسَلَّم فاستَفْتَيْتُ رسولَ اللّهِ صلى اللّهُ تعالى عَلَيْهِ وَسَلم قُلْتُ انَّ أُمي قَدِمَتْ وَهِيَ راغِبَةٌ أفأصِلُ أُمِّي قَالَ نَعَمْ صِلِي أُمَّكِ».

تەرجەمە

دەگێڕنەوە لەئەسمای کچی حەزرەتی ابو بکر ﷺ گوتی قوتەیلەی دایکم کچی عبد العزی کوڕی ئەسەد کە باوکم ئەبو بەکر لەزەمانی جاهلیەت تەلاقی دابوویەدیاری لە مێوژو روون و شتی تریش هاتە لام. منیش دیاریەکەم لێ قبوول نەکرد لێش نەگەرام بێتە ژووری ماڵی چونکی موشرکە بوو ئنجا بە پێغەمبەرم گوت بەم تەرزە عەرزم کرد دایکم هاتووە حەزیشی لێیە شتێك وەربگرێ یا خۆ مەعنا تارکە بۆ دینی منیش. (چونکی رغبة ئەگەر بە (عن) تەعەدی بکا بە مەعنا تەرکە وەکوو ﴿أراغب أنت عـــن آلهتي يا ابراهيم﴾ ئەگەر بەتەعەدی بکا بە مەعنا شەوق طەلەبە لێرەش لەفظی راغبە چونکی موقەیەد نیە بە هیچیان هەردوو مەعنا هەڵدەگرێ. ئەگەر ئنجا صلەی رەحمی دەرحەق بەجێ بگەینم پێغەمبەرﷺ فەرمووی صلەی رەحمی دایکت ئەدا بکە.

دروست بوونی قبولی هەدیە لە کافرانیش وە دروست بوونی ئەدای صلەی رەحم دەرحەق بە ئەقاربی کوفاریش. لەم حەدیسە پیرۆزە وەرگیراوە. هەتا ابن عویەینە گوتیتی. بۆ تەصدیقی ئەم حەدیسە ئایەتی ﴿لا ینـــهاکم الله عـــن الذیـــن لم یقاتلوکم في الدین .... الخ﴾ هاتە خوارێ. یەعنی خودا نەهی لە چاکەی ئێوە ناکا دەر حەق بەو کافرانەی شەڕیان لەگەڵ ئێوە نەکردبێ.

# باب العمرى والرقى

# باسى بەخشینی بە دریژایی تەمەن

٦٨٢- ((عن جابر ﷺ قَالَ قَضى النبيُّ ﷺبِالعُمْرى أنها لِمَنْ وُهِبَتْ لَهُ)).

## تەرجەمە

دەگیرنەوە لە جابری کوری عبدالله انصـاری ﷺ گوتـی پیغەمبـەرﷺ حوکمـی فەرمووە بە صحتی عومرا بەم تەرزە فەرموویتی عمری مـالّی ئـەو کەسـەیە پـێ‌ی هبـە دەکرێ.

(با بزانین عومرا چی‌یە)

عومرا ئەمەیە کەسێك بەکەسێك بلّێ تا تۆ ماوی یا تا من ماوم ئەم خانوەم بەتۆ بەخشی یا هبەی تۆم کرد. یا خۆ تا تۆ لە حەیات دای. یامن لە حەیات دام ئەم خانووە ئی تۆیە. ئەم هبەیەیە راستە بۆ ئەو کەسەی دەی درێتی. حوکمی روقبـا لـەم صحەتـە وەکوو عومرایە.

با بزانین روقبا چی‌یە: روقبا ئەمەیە یەکێك بەیەکێك بلّێ ئەگەر من لـە پیـش تـۆ مردم ئەم خانووە بۆ تۆیە یان با ئی تۆ بێ. وە ئەگەر ئەگەر تۆ لەپێش من مـردی ئـەم خانووە ئی منە. ئەم رقبایە لای ئیمامی ئەعزەم وە ئیمامی مالك وئیمامی محمد باطلـە لای مجتهدەکانی دیکە و ئیمام ئـەبو یوسـف دروستە. بۆیـە بەعـەقدی پیشـوو دەلّێـن عومرا چونکی بە عومر واتە (تەمەن) تەعبیر دەدرێ. بـەم تـەرزە دەگوتـرێ تـا عومـرم مایە یا عومرت ماوە. عەقدی پاشووش بۆیێ پێ‌ی دەلّێن روقبـا چونکـی هـەردوولا لـەو کەسەی دەبەخشێ و لـەوەی پـێ‌ی دەبەخشـرێ. هـەردەم چـاوەرێ‌ی مردنـی یـەکتری دەکەن.

بۆ عەقدی پێشوو کە عومرایە ئیمامی نەوەوی بە نەقل لە ئەصحابی شافعی گوتیتی سێ ئەحوال هەیە:

یەکی‌یان: ئەمەیە بڵێ اعماری تۆم کرد ئەم خانووە. یەعنی تا تۆ ماوی ئەم خانوەم دا بە تۆ. وەکوو تۆش مردی بۆ میرات گرەکانت بێ ئەمە بە اتفاق و بەبێ‌خلاف صحیحە. ئەمە هبەیکە ئەو کەسەی هبەکە وەر دەگرێ پێی دەبێتە خاوەنی خانوەکە. وەکوو مرد ئەگەر وارثی هەبێ بۆ وارثەکانە. ئەگەر نا بۆ بیت المالە. نا گەڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی هبەی دەکا.

دووەم: ئەو کەسەی هبە دەکا هبەکەی تەنها لەسەر ئەمەندە دەڵێ تا من ماوم ئەم خانوەم دا بەتۆ. بەڕاستی ئەمە لای ئیمامی شافعی دوو قسە هەیە. راست ترینەکەیان قسەی تازەی تی کە دەڵێ ئەم جورە هبە راستە.

سێیەم: ئەو کەسەی هبە دەکا اقتصار نەکا بەڵکی دەڵێ تا من ماوم ئەم خانوەم دا بەتۆ ئەگەر تۆ مردی بۆ من بگەڕێتەوە. یا بۆ وەرەثەم بگەڕێتەوە. ئەمەش هبەکەی راستە شەرتەکەی باطلە. لای ئیمامی ئەحمەد عومرای مطلقە راستە عومرای کاتی (مؤقت) راست نی‌یە. ئیمامی مالکیش گوتیتی عومرا لە هەموو ئەحوالیك تەنیا تەملیکی سوودەکانی خانووە. تەملیکی خانووەکە نی‌یە. لە خصوصی عومرا مەزهەبی حەنەفی وەکو مەزهبی شافعی‌یە. بەڵام لە خصوص روقبا هەروەکو لە پیشەوە بەیان کرا. ئیمامی ئەعزەم و مالك ومحمد لەسەر خلافی ئیمامی شافعی و مجتهدەکانی تر و ئیمام ئەبو یوسف حوکمیان بە بطلانی کردووە. (شرقاوی جلدی ٢ لاپەڕە (٢٥٩)

# باب فضل المنحه

# باسى گەورەیى منحه

# وەكوو دانى بزنه بەدۆ

٦٨٣- «عن عبد الله بن عمر ﷺ أربعونَ خَصْلَةً أعْلاهُنَّ مَنِيحَةُ العَنْزِ. ما مِن عامِلٍ يَعْمَلُ بِخَصْلَةٍ مِنْها رَجاءَ ثَوابِها. وَتَصْديقِ مَوْعودِها الاَ أدْخَلَهُ اللّهُ بِها الجنَّةَ».

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە عبدالله ى كوڕى عومەر ﷺ پێغەمبەرﷺ فەرمووى چل خەسلەت هەیە بالاترینى هەموویان بزنە بەدۆى مۆقەتە بۆ دۆشین بدرێ بە موحتاج هەر ئەهلى خێرێك یەكێك لەم چل خەسلەتە بكا بە ئومێدى گەیشتن بە ئەوابەكەى بە باووركردن بەو ئەجرى كە وەعدە دراوە لە بەرامبەر ئەم خەسلەتانە. الا مەگەر خوداى گەورە بەبێ گومان بەیەكێك لەم چلە دەیباتە ناو بەهەشت: لەم ئەوابە مەرى بە نو ووشترى بە دۆیش وەكوو بزنى بەدۆیە.

# كتاب الشهادات

# باسى شاهیدى

# بسم الله الرحمن الرحیم

# بەناوى خوداى بەخشندەى میهرەبان

٦٨٤- «عن عبدالله ابن مسعود ﷺ خَيْرُ النَّاس قَرْنِي ثُمَّ الذينَ يَلونَهُمْ ثُمَّ الذينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ يجَيء اقْوامٌ تَسْبِقُ شَهَادَةُ أحَدِهِم يَمِينَهُ وَيَمِيُنُه شَهَادَتَهُ».

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە عبدالله کوڕی مەسعود ﷺ ئەویش لە پێغەمبەرﷺ گوتی فەرمووی باشترینی خەڵکان ئەهلی زەمانی منە پاشان ئەهلی پاش زەمانی ئەوانێ کە تابعینن. یەعنی چاویان بە اصحاب کەوتبێ. پاشان ئەهلی پاش زەمانی تابعینن. پاشان چەند قەومێك دێن لەبەر هەوەسیان بۆ جێ بەجێ کردنی ویستیان لە موحاکەمات. یەکێکیان شاهیدی دەدا پاشان سوێندیکیش لەسەر دەخوا. هەندێ جاریش پیشان سوێند دەخوا. لەپاشان شاهیدیش لەسەر دەدا.

(ش) ئیمامی مالك بەوەرگرتن لەم حەدیسە فەرموویتی کەسێك شاهیدی بداو سوێندیش بخوا شاهیدی مەقبوول نییە. بەڵام لای جمهوری ئیمامەکان و مجتهدەکان مەقبوولە رەد ناکرێتەوە. لە مەزهەبی حەنەفیش ئەوەی شاهیدی لەسەر دەدرێ واتە مەحکوم علیە لە پێش حوکم. بۆی هەیە تەکلیف لە حاکم بکا شاهیدان سوێند بدا کە ئێمە لەم شاهیدیە درۆ ناکەین. وە بۆ حاکمیش هەیە بلێ ئەگەر ئێوە شاهیدییەکەتان بەهێز نەکەن بە سوێند شاهیدیتان قبوول ناکەم.

٦٨٥- «عن ابی بَكْرَةَ ﷺ الا أُنَبِّئُكُمْ بأكْبَرِ الكَبائرِ ثلاثاً قالوا بَلى يا رسولَ اللّه. قالَ الاشراكُ باللّهِ وَعُقُوقُ الوالِدَيْنِ وَجَلَسَ وَكانَ مُتَكِئاً فَقَالَ ألا وَقَولُ الزّورِ فَما زَالَ يُكَرِّرُها حَتّى قُلْنا لَيْتَهُ سَكَتْ».

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە ئەبی بەکرەتە(نفیع ثقفي) ﷺ گوتی پێغەمبەرﷺ فەرمووی باش ئاگادار بن خەبەرتان پێ دەدەم بەوەرگرتنی هەموو گوناهەکانی گەورە. سێ جار وای فەرموو بە ئاگادارکردنەوەی گوێگر هەتا خۆی ئامادە بکا بۆتی گەیشتی. ئەصحابی کیرام گوتیان هاری یا رسول الله پێمان بلێ فەرمووی:

یەكی‌یان: شریك پەیداكردنە بۆ خودا.

دووەم: ئەزیەت دانی دایك و باوكە چە بە كردەوە چە بە قسە. (بەپاڵ كەوتی ئەم دوانەی دا) هەڵستا دانیشت بۆ بەدیار خستنی رێزی سێیەمیان ئنجا فەرمووی:

سێیەم: باش ئاگادار بن قسەو شاهیدی بەدرۆیە. ئیتر لەسەر دووبارەكردنەوەی ئەم سێیەمە ئەمەندە دەوامی كرد. دڵمان پێ سووتا چونكی زۆر پێ متأثر بوو. هەتا بە غایەتێك گوتمان كاشكی سكوتی بفەرموویایە.

(ش) ئەمە دەلالەتە لەسەر دابەش بوونی گوناهی گەورەو گەورەتر. وەلەم حەدیسەش وەردەگیرێ. هەبوونی گوناهی بچووك چونكە گوناهی گەورە(كبیرە) بەنسبەت گوناهی بچووك گەورەتر (اكبر)ە. مەبەست دیاركردنی گوناهی گەورە نییە لەم سێیانە. بەڵكی اقتصار لەبەر موناسەبەی ئەم سێ یانە بووە. بۆ ئەوانەی گوێ دەگرن لە وەقتی ئەم حەدیسەی فەرمووە.

٦٨٦- ((عنْ عائشة ﵂ رَحِمَهُ اللهُ لَقَدْ أذْكَرَني كَذَا وَكذا آية أسْقَطْتُهُنَّ مِنْ سورةِ كَذا وَكَذا. يا عائِشَة أصَوْتُ عَبَّاد هذا قُلْتُ نَعَمْ قَالَ اللّهم ارْحَمْ عَبَّادا)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لەحەزرەتی عائشە (رەزای خودای لێ بێ) پێغەمبەر ﷺ گوێی لە عبداللەی كوڕی زەیدی ئەنصاری بوو. لە مزگەوت قورئانی دەخوێند فەرمووی رەحمەتی خودا لەم قاریە بێ. فلان ئایە تو فلان ئایەتم لە فلان سورەت و فلان سورەت لە غەیری ئەحكام لە بیرم چووبوو بەبیری هینامەوە. (تەرجەمەی یا عائشە تا ئاخر لە حەدیسی پاشوو دێ) هەندێ عولەما بە وەرگرتن لەم حەدیسە فتوایانداوە بە صحەتی شەهادەت بە موجەرەدی ناسینی دەنگ بەبێ دیتنی ئەو كەسە بەچاو. چونكی پێغەمبەر ﷺ لە كاتی خوێندنی عبدالله ی نەدەدیت. وەكوو دوعای بۆ كرد. چونكی لە ماڵی عائشە بوو. عبداللەش لە مزگەوت بوو. بەڵام لای حەنەفی و شافعی شاهیدی كوێر

مەقبوول نی‌یە. لە کارو باری بیستن نەبی وەکوو نەسەب و مردن. وەکـوو ئیمام ئـەبوو یوسف وەریش دەگێڕیٚ لەم حەدیسە. لە بیر کردن دەرحەق بە پێغەمبەریش دروستەلە غەیری ئەو ئەحکامانەی کە واجبە راگەیاندنیان.

٦٨٧- ((عن عائشة ﷺ یا عائِشةَ أصَوْتُ عَبَّاد هـذا قُلْتُ نَعَمْ قَالَ اللّٰهُمَّ ارْحَمْ عَبَّاداً)).

## تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە حەزرەتی عائشە (رەزای خودای لیٚ بیٚ) پێغەمبەرﷺ لە خـانوی من تەهەجودی دەکرد. گویٚی لـە عـەبادی کـوڕی بشـری ئـەنصاری ئەشـهەلی بـوو. لـە مزگەوت قورئانی دەخوێند. فەرمووی ئەی عائشە ئـەم دەنگـە دەنگـی عـەبادە منیـش گوتم بەڵیٚ:فەرمووی ئەی خودایە رەحم بەعەباد بکەی. ئیمامی بوخاری بە استدلال بەم حەدیسە تەنفیذی شاهیدی یەك ژنیشی کردووە. لە جێگاییێك کە هیچ پیاوی تیـا نـەبیٚ. چونکی پێغەمبەرﷺ تەنیا بەقسەی حەزرەتی عائشـە لـەپاش بـاوەڕکردنی دوعـای بـۆ کرد.

## حدیث الافك

## باسی بوختان

٦٨٨- ((عن عائِشَةَ ﷺ كيْفَ تِيكُمْ فَقُلْتُ ائْذَنْ الی أبَـوَيَّ فَأذِنَ فَدَعَا بَرِيـرَةَ. فَقَالَ يابَرِيرِةَ هَلْ رأَيْتِ فيها شيْئاً يُرِيبُكِ قَالَتْ لا قَالَ مَنْ يَعْذِرُني مِنْ رَجُلٍ بَلَغَنى أذَاهُ فى أهْلي فَوَاللهِ مَا عَلِمْتُ على أهلي الاّ خيراً. وَقَدْ ذَكَروا رَجُلاً مَا عَلِمَتُ عليهِ الاّ خَيْراً. وَماَ كانَ يَدْخُلُ عَلى أهلي الاّ مَعِي. ثُمَّ قَالَ يا عائِشَةَ فَأنَّهُ بَلَغَنى عَنْكِ كَذَا وَكَذَا. فَأنْ كُنْتِ بَرِيئَةً فَسَيُبَرِّئُكِ اللهُ. وَانْ كُنْتِ ألمَمْتِ فاسْتَغْفِرِ اللهَ. فأن العبْدَ اذا اعتَرَفَ بِذَنْبِهِ ثُمَّ تابَ تابَ اللهُ عَلَيه فَقُلتُ واللهِ ما أجِدُ لی وَلَكم مثَلاً الا أبا يوسف إذْ قَالَ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ واللهِ المسْتَعانُ عَلى ما تَصِفونَ فَلَمَا سرَي قالَ ياعائِشَةَ احْمَدِی اللهَ. فَقَدْ بَرأَكَ اللهُ فانْزَلَ اللهُ تعَالى «انَّ الَّذين جاؤا بالأفكِ عُصبة منْكُمْ» الايات وكان يسْأل

زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ عَن أمرى فقالَ يا زَيْنَبُ ماعَلِمْتِ ما رأيتِ فَقَالَتْ يا رسولَ اللهِ احمى سمَعى وَبَصَرى واللهِ ما عَلِمْتُ عَلَيْها الاّ خَيْراً)).

تەرجەمە

دەگێڕنــەوە لــە حــەزرەتی عائشــە (ڕەزای خــودای لیّ بــیّ) گوتــی وەکــوو پێغەمبەرﷺ بیویستایە بچێتە سەفەرێك قورعــەی دەهاوێشـت لـە بـەینی ئافرەتـەکانی خۆی بۆ راگرتنی دڵیان. ئنجا قورعە بەبـەر هـەرکامێك بکەوتایـە ئـەوەی لەگـەڵ خـۆی دەبرد.لەو سەفەرە. وەقتێك ویستی بچێتە غەزای بـەنی مصطلـق لـە خوزاعـە. قورعـە بەبەرمن کەوت پێغەمبەرﷺ بە لەشکرەوە لەمەدینـە ڕۆیشـت منیـش لـە خزمـەتیدا لـە کەژاوەیەك سوار کرابووم ڕۆیشتین هەتا پێغەمبەرﷺ لە غەزای خۆی بـووە گەڕاینـەوە بۆ مەدینە. شەوێك لە نزیك مەدینە فـەرمانیدا بارکـەن. لـە کـاتی راگـەیاندنی فـەرمانی بارکردن من هەڵستام بۆ سەرپێشـاو (قـەضا حاجـەت) لـە لەشـکر دوور کەوتمـەوە. لـە پاش ئەدای مطلب گەڕامەوە لای بارەگەو کەژاوەکەم. دەستم لە سنگم دا خەناوکەم لە ملم نەمابوو. خەناوکەکەیش لە جەزعی ئەظفاربوو. دایکم لە کاتێ بووکینی بۆ خدمـەت پێغەمبەرﷺ لە ملی کردبـووم. دانـەکانی ڕەش بـوو بـە دەمـاری سـپی بـۆز داگـەرابوو (أظفار) شاریکە لە یەمەن. )) منیش وەکـو زانیـم خەناوکـەم پسـاوە گەرامـەوە جـێی قەضا حاجەت خەریك بووم بە دۆزینەوەی مۆرووەکـان بـەم شـەوە. بـەڵام لاشـم وابـوو ئەگـەر لەشـکر مـانگیگ لـەوی حـەپس ببـیّ ووشـتری مـن راسـت ناکەنـەوە تـا مـن لــە کەژاوەکـەی خـۆم نـەبم ئـەو کەسـانەی کـە تایبـەت و مخصـوص بـوون بــە بـارکردنی کەژاوەی من. هاتن ووشتری منیان راست کردەوە و کەژاوەیان لیّ بارکرد. واتێ گەیشتن من لەناو کەژاوەدا دانشتووم. طائفەی ژنانیش ئەو کاتە لەبەر کـەم خواردنیـان(چونکـە خواردن کەم بوو) قەڵەو نەبوون. گرانیو قورسیان لە کاتی بارکردن هەسـت پـێ بکـرێ کە بزانن کەژاوە کەسی لەناودا نییە. بەڵکی لەبــەر تەختـەو داروبـارو گوریـس وکنـدرو

ئەسباب و ئالاتی کەژاوە. وەکو بڵندیان کرد لەبەر گرانی. کەژاوەکە بەدڵیان دا نەهات من لەناونیم. بەڵکی یەقینیان بوو کە من لە ناو دام چوونکی سووک و منالْ بووم تەمەنم نەگەیشتبووە یازدەسالْ. خولاصە لەشکر بەووشترو کەژاوەی منەوە ڕۆیشتن منیش خەناوکەم دۆزییەوە. گەرامەوە لای لەشکر هیچ کەس نەمابوو. لە دڵی خۆم فکرم کرد گوتم بچم لەجێگایەکەی خۆم دانیشم ظەنم وابوو لە شوێنم دەگەرین. چوومەوە جێگایەکەی خۆم. لەوێ خەوم بەسەردا باری. خەوم لێ کەوت صەفوانی کوڕی موعەطەلی سولەمی. کە یەکێك بوو لەپیاو بەڕێزانی یارانی پێغەمبەرﷺ. لە دوای لەشکر دەهات. هەرجارە بەفەرمانی پێغەمبەرﷺ. ئەوەك شتێك لە لەشکر بەجێ مابێ. یاخۆ کەوتبێ بی هێنێتەوە هەر وەکو لە حەدیسی حەزرەتی عومەر وا دەلێ. لە وەختی بەیانی گەیشتە مەنزلی من. چاوی بە انسانیکی خەوتوو کەوت. هاتە پیش لە پیش ئایەتی حیجاب منی دیبوو دەی ناسیم لە دەنگی ئەو بەخەبەر هاتم کەدەی گوت (لا حول ولا قوة الا بالله) ووشترەکەی خۆی یخ کرد. قاچی لەسەر دەستی ووشترەکەی خۆی دانا. بۆ خاتری بەسووک و ئاسانی سوار ببم. من سوار بوم صەفوانیش جەلەوی راحلەی رادەکێشام تاپیش نیوەڕۆ گەیشتینە ناو عەسکەر. ئنجا بە هیلاك چوو ئەوی بەهیلاك چوو بەسەبەب بوختان. سەرۆکی جەماعەتی بوختان(إفك) عبدالله ی کوڕی ئوبەی بوو دایکیشی ناوی سەلول بوو. موسەطەحی کوڕی أثاثە وە حسانی کوڕی ثابت وە حەمنەی کچی جحش. لای ئەوانی گرت هاتینەوە مەدینە من مانگێك نەساغ کەوتم قسەی بوختانیش لەناو خەڵکی دەگەرا. منیش لە هەموو شت بێ ئاگا بووم. بەلام هەستم دەکرد بەزەیی و شەفەقەتی پێغەمبەرﷺ دەرحەق بەخۆم لەم ناساغیەم بە گوێرەی نەساغیەکانی پێشووم کەمترە. چونکی ئەگەر پرسیاری لێ بکردبامایە. بەسەری زمان دەیگوت چلۆنن. وانە بوو وەکو جاران بلێ ئەی عائشە نەساغیەکەتان چلۆنە. دوسێ قسەم لەگەڵ بکا بێ لوطفیم لێ هەست دەکرد. هەتا نەختێك

ناساغیەکەم چاکتر بوو منو دایکی مەسطح بـۆ لای مـەناصع چووین(جێگـای پێشـاوی ژنەپاکەکانی پێغەمبەر بوو لەدەرەوەی مەدینە) لە پێش دروست کردنـی ئـەدەب خانە لە نزیك خۆیان وە لە خانووەکەیان شەویەشەو بۆ ئەوەی دەچوون) منو دایکی مسطح کچی ئەبو روهم ناوی ئەنەس بوو. دەرۆیشتین. دایکی مسـطح قـاچی لـە کراسـی خـۆی ئالا هەڵەنگوت. گوتی هەی مسطح لەسەر روو بکەوێ. منیش گوتم چلۆن قسـەی خراپ دەرحەق بە ئەهلی بەدر دەکەی. گوتی ئەی بێ خەبەر تۆ نازانی چی بوختانێکیـان بە تۆ دا هەڵبەستووە. حیکایەتی افکی بەتەواوی بۆ کـردم. ناسـاغیم دوو قـەد زیـاد بـوو وەکو گەرامەوە ماڵی پێغەمبەرﷺ تەشریفی هاتە لام سـەلامی کـرد فـەرمووی چلۆنن پێم گوت بم نێرەوە لای باوك و دایکم مەقصەدیشم ئەوە بـوو کەشـفی حەقیقـەتی ئـەم خەبەرە لە لایەن ئەوانەوە بکەم ئیزنی دام. هاتمەوە لای باوك و دایکم. بە دایکی خۆم گوت. چییە ئەم قسانەی خەڵك دەیکەن. دایکـم گوتـی ئـەی کچـی خۆشەویسـتی من ئەهوەن بە لە غەمان خۆت مەکوژە. قەسەم بە خودا کەم ژن هەیە جوان بـێ هـەندەی تۆ. رێز گرتنیشی لای مـێردی هـەندەی تـۆ بـێ و هەوێشـی هـەبێ ئیلـلا مەگـەر مطلقـ هەوێیەکان قسەی بەدی دەرحەق دەکەن زۆر هەتا لە پێـش چـاوی مێردەکـەی بخـەن (یەعنی وا نییە ئەم تەرزە بوختانە لەم دونیایە تەنیا دەرحەق بە تۆ کرابێ. ئینجا لـە خەفەتان خۆت بە هیلاك مەدە) ئەوە شەوە بێ پسـانەوە فرمێسـکم دەرژانـد. بە هیچ جۆر خەوم لێ نەکەوت هەتا سبەینا. بۆ سبەینە پێغەمبەرﷺ بانگـی حـەزرەتی عـەلی و ئوسامەی کوڕی زەیدی کرد. لەبەر گیر بوونی وەحی لەو وەقتە ئیستشارەی پێ کـردن لە بەر تێگەیشتنیان. بۆ پرس‌ورا دەربـارەی دوور کەوتنـەوە لـە ژنـان. ئوسـامە گوتـی ئەی پێغەمبەری خودا خێزانت پاکە بـێ قسـورە چونکـی ئەمانـە خێزانی تۆنـە لـە تۆ دەوەشێنەوە دەربارەی پاکی و بێ عەیبی.

(ش) (هەندێ زانایان بەم قسەی ئوسامە دەرحەق بە پاکی عائیشە ئیستدلالیان کردووە بۆ تەعدیلی دوو شاهێدان یەك موزەکی وەکو ئوسامە بڵێ چاکە نەبێ هیچم لێ نەدیوون بەڵام ئیمامی شافیعی گوتیتی تەعدیلی غەیر لە لایەن موزەکی مەقبول نییە هەتا نەڵێ عەدلە. ئیمامی مالیکیش گوتیتی قسەی ئوسامە دەرحەق بە عائیشە کە گوتی چاکە نەبێ هیچم لێ نەدیوە تەزکییە نییە. لای ئەبی یوسف ئەمە تەزکییەیە قسەی راست لای حەنەفییە تەزکییە ئەمەیە موزەکی بڵێ ئەمە عەدلە شاهێدی دروستە) و ئەمما حەزرەتی عەلی گوتی ئەی پێغەمبەری خودا خودای گەورە زۆری لە تۆ نەکردووە بەڵکی بۆ تۆ ویسعەتی هەڵبژارد و ئەمە طلاق بدە ژنێکی تر بێنە (ئەمە قسەی حەزرەتی عەلی ﷺ لەبەر عەداوەتی حەزرەتی عائیشە نەبووە بەڵکی لەبەر ئەمە بوو چونکی گەورەیی غەمی ئەم بوختانەی هەست پێ کرد لە دەروونی ئەو پێغەمبەری وا بە غیرەت. وای بە چاك زانی هەتا پاکی عائیشە دەردەکەوێ بە تەواوی لێی دوور کەوێتەوە. بۆ دامرکاندنەوەی ئەم غەمە گەورەیە، لە پاش دیار کەوتنی پاکی عائیشە. بیگرێتەوەو بیهێنێتەوە بۆیێ فەرمووی پرسیار لەبەریرە بکە. یەعنی ئەگەر حەز دەکەی زوو پاکی عائشە دەربکەوێ بریرە زانایەبە نەهێنییەکانی عائشەچونکی جاریەی خۆیەتی لێی بپرسەزوو بە زوو مەعلومت دەبێ ئەم غەمەشت لەسەر لادەچی بە هۆی چاکی عائشە. ئنجا پێغەمبەرﷺ بانگی بەریرەی کرد فەرمووی ئەی بەریرە تۆ هیچ شتێکی وات لە عائشە دیوە بتخاتە شك لەم قسەی بڵاو بووتەوە لەناو خەڵکی. بەریرە گوتی نا. بەحەقی ئەو زاتەی کە تۆی ناردووە بە پێغەمبەریکی حەق. بە قەطعی شتێکم لێ نەدیوە کە بە عەیبی بزانم ئەمەندە نەبێ لە عومردا مندالە. بەغایەتێك وا بووە من هەویرم کردووە بۆ کولێرە. پێم گووتووە ئاگات لە هەویرەکە بێ. تا ئاگرێك دێنم. من بۆ ئاگر هێنان چووم هەتا هاتوومەتەوە تەماشا دەکەم عائشە

لەبەر هەویرەکە خەوی لێ کەوتووە. مەڕەکانی کە لەناو خانوان دەگەڕێن هەویرەکەیان خواردووە.

(ش) استدلال کراوە بەم تەبریەی بەریرە بۆ حەزرەتی عائشە (رەزای خودای لێ بێ) لەسەر جەوازی تەزکیەی ئافرەتان و راست کردنەوەیان بۆ خەڵکی ئیمامی مالك و ئیمامی شافعي ومحمد ابن حسن مەنعیان کردوە پاشان پێغەمبەرﷺ هەر عەینی رۆژ چووە سەر مینبەر بەدواندان داوای کرد تۆڵە بکرێتەوە لە عبد الله ی کوڕی ئوبەی سەلولی دایکی. گوتی کێ یاریدەم دەدا لەسەر ئەو کەسەی کە ئەم بوختانەی دەرحەق بە ئەهلو عائلەی من رێك خستووە. والله چاکە نەبێ لە ئەهلو عائلەی خۆم نەزانیوە. بوختانەکەشی نسبەت وەبال پیاوێك داوە. چاکە نەبێ لیم نەزانیوە. بە هیچ جورێك نەهاتۆتە ماڵی ئێمە لەگەڵ من نەبێ. سەعدی کوڕی معاذ کە سەرۆکی قەبیلەی ئەوس بوو راست بووە. گوتی ئەی پێغەمبەری خودا والله من تۆلەی تۆ لەو کەسە دەکەمەوە ئەم بوختانەی کردووە. ئەگەر لە قەبیلەی ئەوس بێ لە ملی دەدەین، ئەگەر لە قەبیلەی برایەکانی ئیمانداری خەزرەجیش بێ. هەرچی ئەمرمان پێ بکەی دەرحەقی بەجێ دەگەیێنین. سەعدی کوڕی عوبادە کە رەئیس قەبیلەی خەزرج بوو لەمەپێش پیاوێکی باش لەخوا ترس بوو بەلام لەبەر عەداوەتی کۆنی لەبەینی ئەوس و خەزرەجیان تووشی سەر رەقیەك هات لە قسەی سەعدی کوڕی مەعاذ. راست بووە گوتی درۆ دەکەی والله نایکوژی تۆ ئەگەر لە خۆتان بێ یە عنی بەڵکی ئێمە دەیکوژین وە ئەگەر لە ئێمەیش بێ لەبەر ئێمە پێت ناکرێ بیکوژی بە ئیزنی ئێمە نەبێ. ئوسەیدی کوڕی حوضەیر کە ئامۆزای سەعدی کوڕی مەعاذی ئەوسی بوو. راست [illegible] ڕووی لە سەعدی کوڕی عەبا[illegible] خەزرەجی کرد گوتی تۆ درۆ دەکەی [illegible]حەیاتی ئەزەلیەی خود[illegible] والله دەی دوریین ئەگەر پێغەمبەرﷺ ئەمرمان پێ بک[illegible] تۆ [illegible]صفەتی مونافقان دای دوستایەتی خۆت [illegible]شان دەدەی بەلام لە راستی[illegible] [illegible]وست نی دوژمنی. [illegible]

لەسەر منافقان دەکەیەوە. هەردوو قەبیلە لە یەکتر بڵند بوون. قەصدی کوشتنی یەکتریان کرد. پێغەمبەرﷺ لەسەر مینبەر بوو هاتە خوارێ مەنعی کردن لە گاڵەگاڵو دەنگ بەرزکردن هەتا هەردوولا وازیان لەقسەکردن هێناو ووس بوون. منیش ئەو رۆژە حاڵم هەر گریان بوو فرمێسکم رانەدەوەستا. رۆژێكو دوو شەو بوو لای دایكو باوکم بووم خەوم لێ نەکەوتبوو لام وابوو لەبەر گریانی زۆر جەرگم شەق بووە. وەقتێك دایکو باوکم لای من دانشتبون ئافرەتێکی ئەنصاری بۆ هاتنە ژور داوای ئیزنی کرد. هات لەگەڵ من دەستی بە گریان کرد لەناکاو دیتمان پێغەمبەرﷺ تەشریفی هاتە ژووری لای من دانیشت. کەلەم رۆژەوە ئەم قسەیەش دەرحەق بەمن کرا قەت لەلام دا نەنیشتبوو. یەك مانگیش چوو بوو دەرحەق بەمن هیچ وەحی بۆ نەهاتبوو پێغەمبەرﷺ کلمەی شەهادەی هێناو سوپاسو ستایشی خوای کرد. گوتی ئەی عائشە قسەیەکی وام دەرحەق بەتۆ بیستووە. ئەگەر تۆ لەم قسەیە پاکی خوا تەبریەت دەکا. ئەگەر گوناهێکیش لێت واقع بووبێ استغفار بکە. چونکی عەبد وەکوو اعترافی بە گوناحی خۆی کرد وتۆبەی کرد خودای گەورە تۆبەی قبوول دەکا. وەکو پێغەمبەرﷺ لەم قسەیە بووە. بەغایەتێك فرمێسکم بەگوڕ هاتە خوارێ. هەستم نەدەکرد دنکە فرمێسکەکان کە دێنە خوارێ رووم لە باوکم کرد گوتم بابە لە باتی من جەوابی پێغەمبەرﷺ بدەرەوە گوتی والله نازانم چی بە پێغەمبەرﷺ بڵێم. پاشان رووم لە دایکم کرد گوتم دایە تۆ لەجیاتی من جوابی پێغەمبەرﷺ بدەوە. دایکیشم گووتی والله نازانم چی بڵێم. منیش لە عومر منداڵ بووم هێشتا قورئانم زۆر نەخوێندبوو. گوتم والله دەزانم ئەو قسەی دەرحەق بەمن کراوە بیستیتان و چوویتە ناو دڵتان. ئەگەر بڵێم من لەم افترایە پاکم کە خودای گەورەش دەزانێ پاکم. پێم باوەڕ ناکەن وە ئەگەر اعترافیش بکەم بەو قسەی کە چوویتە ناو دڵتان کە خوداش دەزانی من پاكو بەریئم لەم قسەیە باووەردەکەن. والله بۆ بەینی خومو ئێوە هیچ قسەیەك بە مصلەحەت

نازانم. غەیری قسەی حەزرەتی یەعقوبی باوکی یوسف نەبیّ کە گوتی ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىَ مَا تَصِفُونَ﴾ پاشان لەسەر جێگای خوم رووم سوراندە لای دیوار. وە منیش هەر بە ئومێدی ئەوە بووم کە خودای گەورە تەبریەم بکا. بەڵام خەیاڵی ئەمەم نەدەکرد. ئایەتەکانی قورئان کە بە هەموو زمانێك دەخوێندرێ ونوێژی پیّ دەکریّ دەرحەق بەشەئنی حەقیرەیەکی وەکوو من نازل ببیّ هەر ئەمەندە خەیاڵەم دەکرد ممکنە پێغەمبەرﷺ بەرائەتی من لە خەو ببینیی پاشان سوێند بەخوا پێغەمبەرﷺ لە مەجلیسی خۆی جودا نەبوبووە. وەلەوانەی کە لە مەجلیس دانیشتبوون هیچ کەسێك نەچووە دەریّ لەماڵی خۆمان. هەتا وەحی هاتە خواریّ تووشی بێخودی یەکو سەختیەکو ئارەقە هەڵپرژتنێکی‌وا هات. پشکەکانی ئارەقەی رۆن و منوەری لەسەر کوڵمەی سووروسپی وەکو دانەکانی لۆلۆ دوریّ بچووك خۆیان دەنواند. وەکو لە بێخودی وەحی نەجاتی بوو پێشدەکەنی: یەکەم قسەی ئەوە بوو: پیّی گووتم ئەی عائشە سوپاس و ستایشی خوا بکە بەڕاستی خودای گەورە تەبرئەی کردی دایکم پیّی گوتم بچۆ لای پێغەمبەرﷺ منیش لەسەر شێوەی نازو گلەیی گوتم نا والله بۆ لای خودا نەبیّ بۆ لای کەس ناچمو سوپاسو ستایشی خوداش نەبیّ ئی هیچ کەس ناکەم. ئنجا خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خواری ﴿إِنَّ الَّذِينَ جَاؤُا بالإفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ﴾ هەتا هەژدە ئایەت لە سوورەی نور. یەعنی ئەوانەی ئەم بوختانەیان هەڵبەست جەماعەتێکن لە خۆتان کە عبدالله ی کوڕی ئوبەی رەئیسیان بوو، منافق بوو. زەیدی کوڕی رەفاعە بوو، حسانی کوڕی ثابت بوو مەسطەحی کوڕی ئەثاثەبوو مەعاش خوری حەزرەتی ئەبو بکر بوو خزمیشی بوو. حەمنەی کچی جەحش بوو حەزرەتی ئەبو بەکر سوێندی خوارد گوتی والله هیچی تر مەعاش بە مەسطح نادەم. خودای گەورە ئەم ئایەیەی هە ناردە خواریّ ﴿وَلا يَأتَلِ أُولُوا الفَضْلِ مِنْكُمْ وَالسَّعَةَ أنْ يُؤْتُو أُولِي القُرْبَى ... هەتا.... وَاللهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ حەزرەتی ئەبو بەکر فەرمووی (بَلى وَالله إنّي لأحِبُّ

ن يغفر الله لي) ئنجا مەعاشەكەی بۆ مەسطح وەكوو جاران بەكار خستەوە.
پێغەمبەرﷺ لە ئەحواڵی من پرسیاری لەزەینەبی كچی جەحش كرد كە زیاد لە هەموو ژنە پاكەكانی پێغەمبەرﷺ ئاوزای من بوو داوای هاوسانی لەگەڵ مندا دەكرد گوتی ئەی زەینەبی كچی جحش چیت زانیوە چیت دیوە گوتی ئەی پێغەمبەری خودا گوێچكی خۆم دەپارێزم لەو شتی نەبیستراو كە بڵێم بیستوومە. چاوی خۆشم دەپارێزم لەو شتی نەدیتراو بلیم دیتوومە. والله لە ئەحواڵی عائشە چاكە نەبێ هیچم لێ نەزانیوە كە ئەویش بەجوانی خۆی شانازی لەسەرمن دەكرد لە خدمەت پێغەمبەرﷺ بەڵام چونكی خودا زەینەبی پاراستبوو بە دینو عەقڵی كە هەیبوو بەقسەی ئەوانەی بوختانیان كرد باوەڕی نەكرد.

حكایەت كراوە موسوڵمانێك و دیانەك كەوتنە قسەو گفتو گۆ. دیانەكە گوتی عائشە خێزانی پێغەمبەری ئێوە چی تەرزە روویەكی هەبوو وەكوو هاتە حزمەت پێغەمبەرﷺ گوتی خەناوكەم بزر كردبوو بۆیە لە لەشكر جێمام. موسوڵمان لەوەڵامی دیانەكە گووتی: رووی عائشە وەكوو رووی كچی عمران بوو حەزرەتی عیسای مەلۆتكە كردبوو هێنایە ناو قەومی خۆی بێ مێرد. چلۆن لە دینی خۆت اعتقادت وایە مریەم پاكە. ئێمەش لە دینی خۆمان اعتقادمان وایە حەزرەتی عائشە پاكە. دیانەكە قسەی نەكردهیچ جەوابی پێ نەدرایەوە.

٦٨٩- ((عن أبي بكْرَةَ ﷺ وَيْلَكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صاحِبِكَ مِراراً ثُمَّ قالَ مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مادِحاً أَخَاهُ لا محالَةَ فَلْيَقُلْ أَحْسَبُ فُلاناً واللهُ حَسِيبُهُ ولا أُزَكِّي عَلَى اللهِ أَحَداً أَحْسَبُهُ كَذا و كَذا إنْ كانَ يَعْلَمُ ذلِكَ مِنْهُ)).

## تەرجەمە

(دەگێڕنەوە لە نوفەیعی كوڕی حارثی ثەقەفی كە پێیان گوتووە (بوبەكرە)گوتی پیاوێك مەدحی پیاوێكی كرد لە خدمەت پێغەمبەرﷺ گوتراوە مادحی محجن كوڕی

ئەدرەع بوو ئەوەی مەدحی دەکرا عـەبداللە ذوالنجـادەین بـوو) پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی ئەی واوەیلا بۆ خۆت ملی رەفیقی خۆت پەڕاند ملی رەفیقـی خـۆت پـەڕاند چـەند جـار وای فەرموو پاشان فەرمووی هەر کەسێك لەئێوە ئەگەر مەدحی برای دیـنی خـۆی هـەر دەکا بەبێ شك با بڵێ لام وایە ئەوەی کە لێی دیارە فلان پیاوی باشـە خـواش دەزانـی لە ناوەوە شتۆ پیاوێکە وە لەسەر عیلم و ئیحاطەی خودا بە عالم مەدحی هیـچ کەسێك ناکەم بە اعتباری باطن واتە نێو دڵی ئەو یان لە پاشان چی دەکاو چۆنە لام وایـە فـلان صفەتی باش و فلان صفەتی باشی هەیە ئەویش ئەگەر دەزانـی بـە صفەتـە باشـەکانی گوتراوت متصفە ئەگەر نا نا.

(ش) لەم حەدیسەوە وەردەگیری هەروەکو هەندێ زانا گوتویانـە دروسـتە یـەك پیاو پەسەند و تەزکیەی پیاوێك بکات بەڵام لای ئیمامی شافیعی و مالك و محمد ابن حەسەن دوو پیاو شەرتە.

٦٩٠ اعن عبدالله بن عمر ﷺ مَنْ كانَ حَالِفاً فَلْيَحْلِفْ باللهِ أو لِيَصْمُتْ».

دەگێڕنەوە لە عەبداللە کوڕی حەزرەتی عومەر رەزای خودایان لێ بێ پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی هەر کەسێك بیەوێ سوێند بخوا با سوێند بە نـاوی خـودا یـا بـە صفـەتی خودا بخوا یاخۆ با وس بێ و هیچ سوێند نەخوا.

(ش) سوێند خواردن بە مەخلوق بە بێ سەبقی لسان واتە نەك سـوێندەکە هـەر بەسەر زاری دابێ باش نییە مەکروهـە بـەڵام ئیعتقـادی وا نـەبێ ئـەو گەورەییـەی لـە خودای کردگار هەیە لە مەخلوقیش هەیە ئەگەر نا کفرە.

# كتاب الصلح

## باسی ئاشت بوونەوە.

٦٩١- «عن أمِّ كَلْثومِ بِنتِ عُقْبَة ﵂ لَيْسَ الْكَذَابُ الذي يُصلِحُ بَيْنَ النَّاسِ فَيَنْمي خَيْراً أو يَقُول خيْراً».

### تەرجەمە

لەحەدیسەکانی راست سەلماندراوە لە سێ جێگا درۆ جائیزەو دروستە:

یەکیان: لە کاتی شەڕ لەگەڵ دوژمن و حەرەکاتی عەسکەرییا.

دووەمیان: کین و عەداوەت کەتبێتە بەینی دوو کەس یا دوو عەشیرەت ئینجا بۆ پێك هاتنەوەیان درۆ بکرێ دروستە.

سێیەم: درۆی مێرد بۆ دەفعی عەداوەتی ژنەکەی و لێك جودا نەبوونەوەیان. مەسەلەن بە درۆ بڵێ چومە بازاڕ ئەو قوماشی تۆ دەتەویست نەبوو یا دوکان ئە کرابۆوەو لەم هەر سێ جێگایانە دروستە درۆ کردن بە حەدیس سابتە بۆیشت هەیە لە بۆ مەصلەحەت قیاسی لەم سێ جێگایە بکەی قسەی هەندێکانیش کە گوتویانە درۆ بە قەطعی جائیز نییە لەم سێ جێگایەش بە تەورییە نەبێ مەرجوحە واتە پەسەند کراوە.

٦٩٢- «عن سهل بن سعد ﵁ إذهَبُو بِنا نُصلِحْ بَيْنَهُم أي بَيْنَ أهْلِ قُبا».

### تەرجەمە

دەگێڕنەوە لە سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ئەنصاری ﵁ ئەهلی قوبا لە بەینی خۆیان ناخۆشییەکیان بوو بە غایەتێك بەردیان هاوێشتنە یەکتری خەبەر درایە پێغەمبەر ﷺ ئەمری فەرموو بە ئوبەی کوڕی کەعب و سوهەیلی کوڕی بەیضاو و هەندێ ئەصحاب لەگەڵ من وەرن بچین ئاشتیان بکەینەوە.

(ش) لەم حەدیثە زاندرا دروستە سەرۆکی حکومەت بۆ ئاشت کردنەوەو رێک خستنەوەی خەڵك لە کاتی ناکۆکیان هەر کاتێك پێی زانی دەربچێ بۆ ئەم ئاشت کردنەوەیەو بچی رێکیان بخاتەوە.

## (صولحی حودەیبیە)

٦٩٣- ((عن البرَاء ﷺ هذا ما قاضىَ عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رسولُ اللهِ أنا رسول الله وأنا محمد بن عبدالله ثم قَاَلَ لِعَلي أمْحُ رسول الله فَكَتَبَ هذا ما قاضى محمد بن عبدالله لا يَدْخُلَ مَكَةَ سِلاحاً إلاّ في القِرابِ وأنْ لا يَخْرُجَ مِنْ أهْلِها بِأحَدٍ إنْ أرادَ أنْ يَتَّبِعَهْ وأنْ لا يَمْنَع أحداً من أصْحابِهِ أرادَ أنْ يُقِيمَ بها فَتَبِعَتْهُمْ أبنَةُ حَمْزَة فاخْتَصَمَ فيها عَليّ وَ زَيْد وَ جَعْفَر وَقَالَ الخالَةُ بِمَنْزِلَةِ الأم وَقَالَ لِعَليَ أنْتَ مِنِّي وَأنَا مِنْكَ وَقَالَ لِجَعْفَرْ أشْبَهْتَ خَلْقِي وَ خُلقِي وَقَالَ لِزَيْدٍ أنْتَ أخُونا وَ مَوْلانا)).

## تەرجەمە

دەگێرنەوە لە بەرائی کوری عازب ﷺ گوتی پێغەمبەرﷺ لە ساڵی شەشەمی هیجری لە مانگی ذی القعدة بە نیەتی عومرە داخلی ئیحرام بوو گەیشتە حودەیبە خەڵکی مەککە نەیانهێشت گوتیان ئیمساڵ قبوڵ ناکەین بەڵام ساڵی ئایندە بۆ مەککە وەرە. بەڵام بەو مەرجانەی کە ئێمە دەیلێین پێغەمبەرﷺ لەبەر حیکمەتێك لەسەر ویستی ئەوان موصالەحەی لەگەڵ کردن ئەمری فەرموو بە حەزرەتی عەلی نامەی موعاهەدە بنوسێ لەسەر ئەوەی کاغەز نووسی ئەمە موعاهەدەنامەی محمدی پێغەمبەری خودایە ناردراوەکانی خەڵکی مەککە گوتیان رازی نابین بنووسی پێغەمبەری خودایە چونکی ئەگەر بمانزانیبوایە پێغەمبەری خودایە بۆچی نەماندەهێشت تەنیا بنووسرێ ئەم موصالەحەیە لە محمدی کوری عەبداللە یە ئەصحابە بەرێزەکانی پێغەمبەر لەرکی ئەم قسەیە ئەگەر چی مومکن بوو بیانکوژن بەڵام پێغەمبەرﷺ بە دەلالەتی سورەی ﴿ألم نشرح لك صدرك﴾ چونکی سینەی زۆر فراوان

ـوو ركـی نـەبووەوە فـەرمووی مـن پێغەمبـەری خوداشـم محمـدی كـوڕی عـەبداللە شـم

یەعنی زەرەری نی‌یە هەرکامێکی بنووسن قسەیەکی راستە درۆ نی‌یـە ئـەمری فـەرموو

ـە حەزرەتی عەلی ئەم كەلیمەی پێغەمبەری خودا رەش بکەوە بنووسە حەزرەتی عـەلی

گوتی واللە یا رسول اللە من لە تۆ كەلیمەی پێغەمبەری خودا رەش ناکەمەوە بە قەطعی

یـەعنی واللە جەسـارەت ناکـەم) پێغەمبـەرﷺ كاغەزەکـەی لـەحزرەتی عەلی وەرگرت

بەوەجهی خەلقی عـادەت و موعجـیزە بـە دەسـتی پـیرۆزی خـۆی لەسـەر كاغەزەکـەی

نووسی ئەم موصالەحـە نامەیـە لەلایـەن محمـدی کـوڕی عـەبدواللە یـە چونکـی خـودای

گەورە فێری نووسینی نەکردبوو فێری خوێندنەوەو نووسینی نەکردبوو بـەڵام ئـەمجارە

کە نووسی موعجیزەبوو.

(یەکەمین) لەمەرجەکان کە مەبەست و مورادی ئەهلی مەککـە بـوو لەموعاهـەدە

نامەکە نووسرا ساڵی ئایندە وەکو پێغەمبەر چووە مەککە لـە سـێ رۆژ زیـاتر لەمەککـە

نەمینێتەوە.

(دووەم) هیچ کەس لە ئەصحاب بەشیری رووتەوە نەچێتە ناو مەککە.

(سێیەم) ئەگەر لە مەککە هەر پیاوێك تابعی بوو لەگەڵ خۆی نەبا بۆ مەدینە.

(چوارەم) ئەگەر لەئەصحابیش هەر کەسێك نارەزووی کرد لە مەککە بمێنێتـەوە

ئەوساڵ بەم موعاهەدەیە ئیکتیفایان کرد ساڵی ئایندە دووبارە لە مانگی ذي القعدە بـە

ئەصحابی‌یەوە چوونە مەککە نزیك بوو سێ رۆژ تەواو ببێ خەڵقی مەککە بـە حـەزرەتی

عەلی‌یان گوت موددەی موعاهەدە تەواو بوو بە برایەکەت بڵێ یەعنی بـە پێغەمبـەر بڵـێ

ئیتر لە مەککە بچێتە دەرەوە پێغەمبەرﷺ تەشریفی لە مەککە دەرچـوو دیتمـان کچـی

حـەزرەتی حـەمزە نـاوی عـەمارە یـان ئەمامـە بـوو کـە لـە ئەوەڵەوە هـەر لـە مەککـە

مابۆوەوە کەوتە شوێن پێغەمبەرﷺ بە هاوار هاوار ئەی مامە ئەی مامە دەبەری (بۆیێ

گوتی ئەی مامە چونکە حەزرەتی حەمزە لەگەڵ پێغەمبەر برای شیری بوون) حەزرەتی

عەلی کچەکەی خستە ناو کەژاوە حەزرەتی فاطمە گوتی ئاگات لەکچی مامت بی لە مەدینەیش هەر لای خۆمان بی بەلام وەکو چوونە ناو مەدینە دەربارەی کچەکە حەزرەتی عەلی و زەیدی کوری حارثە و جەعفەری کوری ئەبو تالب دەعواکەیان لی پەیدا بوو حەزرەتی عەلی گوتی ئەمە کچی مامی خۆمە بۆ پەروەردەی ئەو من شایانی بەخێو کردنی ئەوم جەعفەری طیاریش گوتی لەگەڵ ئەمە کە کچی مامە خوشکی دایکیس یەعنی پلکی حەرەمی منە چاودێری ئەو کچە عائید بە منە زەیدیش گوتی ئەمە کچی برای منە چونکی پێغەمبەر لە پێش شەهید بوونی ئیمامی حەمزە زەید و حەمزەی کردبووە برای یەکتری وەکو برایەتی کرد لە بەینی ئەصحابان ئەویش گوتی من لایەقترم بۆ بەخێو کردنی پێغەمبەرﷺ فەرمووی چونکی پلکی حەرەمی جەعفەرە پلکیش لە مەقامی دایکە کچەکە تەسلیمی جەعفەر بکرێ پاشان پێغەمبەرﷺ لەبەر رەوشتی باشی هەر سێیانی بە چەند قسە مەمنون کردو دڵی دانەوە بەم تەرزە بە حەزرەتی عەلی گوت ئەی عەلی تۆ لە خۆمی منیش لە تۆم (یەعنی من و تۆ وەکو یەک وجودین وەکو روحی خۆم تۆم خۆش دەوێ) بە جەعفەریشی گوت تۆ لە خەلق و لە خولق یەعنی لە صورەت لە سیرەت بە من دەچی بە زەیدیشی گوت تۆ برای ئێمەی و لە مەولای ئێمەی.

(ش): لەم حەدیثە پیرۆزەدا مجتەهیدە گەورەکان بە ئیتیفاق لەم حەدیسە پیرۆزەیانە وەرگرتووە · بو حەضانە خوشکی دایک لەپێشە لە سەر خوشکی باوک · چونکە صەفیيەی کچی عبدالمطلب لەو کاتە مەوجود بوو نەدرایە ئەو · درایە خوشکی دایک·· دەربارەی قسەی حەزرەتی عەلیش · کە گوتی واللە· پێغەمبەری ئەم کەلیمە ناکوژێنمەوە رەش ناکەمەوە · ظاهرا ئەگەر چی موخالەفەی ئەمری پێغەمبەر بوو بەلام لە حەقیقەتدا موخالەفە و سەرپێچی نەبوو چونکی ئەگەر چی قانوندەی (الامر فوق الادب)· لە ناو زۆربەی خەڵک رێژە دەگیری · بەڵام بو خەواص (الادب فوق الامر)

دروستە . نابینی حەزرەتی ئەبوبەکر رەزای خودای لیٚ بیٚت لە جیٚی پیٚغەمبەر(ئیمام بوو) پاشان وەکو پیٚغەمبەر هات ئەمری کردە ئەبو بەکری صدیق لە جیٚگەی ئیمام کە میحرابە بمیٚنیٚتەوە. حەزرەتی ئەبوبەکر لەبەر ئەدەب خوی بە پاش خست . یاخو حەزرەتی عەلی لە قسەکەی خوی لەبەر ئەوە بوو جەسارەتی نەکرد. یەعنی کەسیٚك خودا دونیای لەبەر ئەو دانابیٚ چلوٚن جەسارەت دەکریٚ کەلیمەی رسول اللە رەش بکریٚتەوە. لە نووسراوی ئەو .

٦٩٤- (عن ابي بَكْرَةَ ﷺ إنَّ ابْنِی هَذا سَيِّدٌ وَلَعَلَّ اللّهَ أنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ عَظيمَتَيْنِ مِنَ المُسْلِمِينَ).

## تەرجەمە

دەگیٚرنەوە لە ئەبو بەکرەی نوفەیعی کوری حارث ﷺ، گوتی دیتم پیٚغەمبەرﷺ لەسەر مینبەر بوو، حەسەنی کوری عەلیشی لە تەنیشت راوەستابوو، جاریٚك تەماشای خەلکی دەکرد جاریٚکیش تەماشای حەسەنی دەکرد، دمیشی فەرموو ئەم کورەی من سەیدە رئیسە، واتە گەورەیەوسەروٚکە. لایقە خودایگەورە بەم کورە ئاشت بوونەوەو ریٚك کەوتن بخاتە بەینی دوو لای گەورە.

(ش) ئەم قسە هاتە جیٚ بەم تەرزە وەکو عبدالرحمن کوری ملجەم موڕادی روٚژی جومعە حەڤدەی رەمەزان لە سالی چل هجری حەزرەتی علی شەهید کرد. هەر لەمانگی رەمەزان لەلایەن خەلکی عیراق حەسەن کرایە خلیفە، حەزرەتی مەعاویە کە لە شام بوو چلوٚن بەیعتی بەحەزرەتی حەسەنیش نەکرد، ئنجا حەزرەتی حەسەن لە مەدینەوە لە شکریٚکی لە چل هەزار کەسی سوند خوٚر لەسەر مردن رای کیشا بوٚ لای شام مەعاویەش بەلەشکریەوە هاتن، لە کوفە هەردوو لای بەم دوو لەشکرە گەورەوە گەیشتنە یەك مەعاویە بیری کردەوە، هیچ یەکیٚك لەم دوو لەشکرە گەورە ناشکیٚ، هەتا کوشتاریٚکی زوٚر، لە هەردوولا نەکریٚ. دوو پیاوی لە قورەیشیان لەبەنی عبدی شەمس

یەکی یان عبد الرحمن کوڕی سەمرەو ئەویتریان عبداللە ی کوڕی عامری کوڕی کریزی- نارده خدمەت حەزرەتی حەسەن ((بۆ صلح لەسەر هەرشتەکی کەبی یەویّ، حەزرەتی حەسەن فەرمووی باشە، چونکی لەئەبی بەکرە، عەینی ئەم حەدیسەم بیستووە- دەرحەق بە خۆم کە فەرموویتی (ان ابنی هذا سید . الخ) ئنجا صلحی هەڵبژارد لەسەر چەند شروط، بەلام هەمووی بەجێ نەگەیشت موعاویەش لەبەرامبەر هەڵبژاردنی صلح سێ سەد هەزار دینارو هەزار قەد شمەك و سەد ووشتری پێشکەش کرد، بۆ مەدینە گەڕایەوە.

(ش): لەم حەدیسە وا دەزاندری دروستە هاتنە خوارەوە لە کاروباری دین‌ودنیا بە مالّ. وە دروستە مال وەربگیریّ لەبەرامبەر ئەم تەنازول‌و هاتنە خوارەوەیە. (عینی جلدی ٦، ص ٤٣٠ شرقاوی جلدی ٢، ص ٢٧٤) ئەم خەبەردانەی بەغەیب، لە لایەن پێغەمبەرﷺ بەمودەی ژیانی دونیا، سەدەلەپاش سەدە بە موعجیزەیەکی گەورە دەگەڕێتەوە.

ابن الاثیر گوتیتی حەزرەتی حەسەن، وەکوو ئەمری خەلافەتی تەسلیمی مەعاویە کرد. پشتی ئەو لاپەرەی کە مەرجەکانی تێدا بوو لیّی کردەوە کە مۆرکرابوو بە مۆری مەعاویە. مەعاویە نەی هێشت گوتی ئەوا بەتۆم دا ئەوی تۆ دەتەویّ.

داواکەی حەسەنیش مالّی بیت المالی کوفەبوو کە پێنج ملیۆن بوو، خەراجی مالّی حیرە بوو لە فارس، کرماتی گوتیتی حەسەن لە هەموو کەس زیاتر حەقی خەلافەتی هەبو. بەلام لەبەر لەخۆ بردووی خۆی ترسانی لە خوداو رازی بوون بەوەی کەخودا بە ئەوەی دا بوو وایّ کرد کە پاشەیەتی و سەلطەنەتی نەویّ.

٦٩٥- ((عن عائشة ﷺ أيْنَ المتَأَلِّي على اللهِ لا يَفعَلُ المعْرُوفَ، فَقَالَ الرجلُ أنا يا رسولَ اللهِ ولَهُ أيُّ ذلكَ أحَبُّ)).

## تەرجەمە

دەگێرنەوە لەحەزرەتی عائشە کاتێك کە پێغەمبەرﷺ تەشریفی لە مـاڵی بـوو، دووکەس لەسەر قەرز لە پێش دەرگا بەدەنگی بەرز شەڕە قسەیان بوو. کابرای قـەردار دەپاڕاوە لە خاوەن قەردەکە کە لە قەرزەکە هەندێکی بۆ فرە بدات، یا موهلەتی بدات، خاوەن قەردیش دەی گوت والله هیچیـان ناکـەم پێغەمبـەرﷺ لەدەنگە دەنگـی ئـەوان هاتە دەرێ. فەرمووی کامەتانن سوێند دەخۆن کە چاکە ناکەم. کابرای خاوەن قەرز بە پەشیمانی یەوە گوتی منم ئەی پێغەمبەری خودا. با بۆ قەرزارەکەم بێ هـەرکامێ حـەز دەکا. چەکەم کردنەوەی قەرز چە بە موهلەت دانێ.

لەم حەدیسە وا دەزاندرێ کە پێویستە مەرحەمەت بەقەردار، بەڵێ خۆش بوون لە هەندێك لەم قەرزە وە زەجر هەیە بۆ ئەوەی سوێند دەخوا لەسەر چاکە نەکردن. وە ئەوەش دەزاندرێ کە ئەصحابەی پێغەمبـەرﷺ چـەند زوو لـە مەبەستی پێغەمبـەرﷺ گەیشتوون وە مەبەستیان بووە چاکە بکـەن. وە چاو پۆشینیش هەیـە لــە دەنـگ بەرزکردنەوە لای حاکم وە ئەوەش هەیە کە دروسـتە قـەردار داوای لێ بوردنـی هـەندێك لەقەرزەکە بکات. بەڵام لای ئیمامی مـالكو حەنـەفی ئـەم پرسیارە مەکروهـە(پەسـەند نی‌یە) چونکی مل کەچی تیایە. ئیمامی نەوەویش کە لە زانایانی شـافعیە فەرموویـەتی زیانی نی‌یە ئەگەر نەبیتە هۆی مل کـەچی و ئـازاردان. ئەگـەر بگوتـرێ خـاوەن قـەرزی سوێند خۆر ئایا لێرە کەفارەی لەسەر هەیە.

خاونی (تەوضیح) گوتیتی ئەگەر سوێندەکەی لەپاش هاتنە خوارەوەی کەفارە بووبێ کەفارەی لەسەر بووە. ئەگەر نا نا. نەوەویش گوتیتی سونەتە بۆ کەسێك سوێند بخوا لەسەر کردنی ئیشی خێر. سوێندەکە بشکێ پاشان کەفارە بدا.

## كتاب الشروط

## باسی شروط ( مەرجەكان )

# ئەمەش بە پشتیوانی خوای گەورە لە بەرگی شەشەمدا چاپ دەكەین

**سبحان ربك رب العزة عما یصفون وصلى الله على سید الخلق محمد وعلى أله وأصحابه الدر المیامین.... وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمین**

ژمارەی سپاردن ( [illegible] ) بۆ ساڵی ١٩٩٩ لە كتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەر ـ هەولێر.